


# فەلسەفەی هیگڵ

نووسینی : د. محەمەد کەمال

بابەت: فەلسەفی

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ:١٢٥٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ١٩٠٠ی ٢٠٠٩

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپی: دووەم ساڵی ٢٠٠٩

کوردستان- سلێمانی
www.sardam.org

بۆ پەیوەندیکردن بە زنجیرە کتێبەوە: kteb@serdam.org

پێشکەش بە مامۆستام موحەمەدئەمین ئەحمەد کە جیهانی بەرینی فەلسەفەی بە من ناساند.

# ناوەڕۆک







# پێشەکی

هیگڵ لە مێژووی فەلسەفەدا جێگای تایبەت و گرنگی خۆی هەیە. باوەڕ ناکەم فەیلەسووفێک پاش ئەریستۆ هەبێت کە هێندەی ئەم زانایە کاری کردبێتە سەر بیرکردنەوەی فەلسەفییانەی پاش سەردەمەکەی. کەم فێرگەی فەلسەفیش هەن، بە باش و بە خراپ، سوودیان لە بیروڕاکانی هیگڵ وەرنەگرتبێت.

شاگردەکانی هیگڵ پاش مردنی مامۆستاکەیان لە بەرلین کەوتنە مشتومڕ و نێوانیان لەسەر لێکدانەوە و تۆژینەوەی فەلسەفەی هیگڵ تێکچوو. ئەم شاگردانە، بەتێکڕا، بوون بە دوو دەستە و تاقمەوە. دەستەی یەکەم کە بە ڕاستڕەو ناسراون لەم زانایانە پێکهاتووە: گۆشێل ڕۆسن کرانز، ئێردمان (کوڕی فیختەی فەیلەسووف)، ئێدواز زیلەر و کۆنۆ فیشەر. ئەم زانایانە لە ڕووانگەیەکی ئایدیالیستانەوە دەیانڕوانییە فەلسەفەی هیگڵ و شێوازێکی میتافیزیکی و ئایینییان دەدایە. بۆ ئەمان هیگڵ یان فەلسەفەکەی لە خزمەتی ئاییندا بوو، یان هەوڵ دەدات بنچینەکانی ئایینی مەسیحی پتەو و بەهێز بکات. بێگومان، هەرچەندە بۆچوونەکانی هیگڵ لەمەڕ بوونی خوداوە فەلسەفییانەیە و خوای ناو فەلسەفەی هیگڵ لە خوای مەسیحیەتەوە دوورە، بەڵام لە زۆر شوێندا هیگڵ هەڵوێستێکی پۆزەتیڤی لە ئاستی ئایینی مەسیحیدا هەیە و بە بەرزترین فۆرمی ئایینی دادەنێت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە هیگڵ ئایینی پێش فەلسەفە دەخات، بەڵکوو بە پێچەوانەوە، بۆ ئەم زانایە، زانینی فەلسەفییانە بەرزترین فۆرمی زانینە و لە ئایینیش بەرزترە.

هەڵوێستی پۆزەتیڤی هیگڵ لە ئاستی مەسیحایەتیدا لەوەدایە کە

بە دیدی ئەم و بەگوێرەی لۆجیکە دیالێکتیکەکەی، لە کەسایەتیی عیسادا، بابەت و دژەبابەت، هەمەکی و هەندەکی، خوا و مرۆڤ یەکیان گرتووە و بوون بە یەک.

دەستەکەی دیکە کە بە چەپڕەو ناسراون و دژی بۆچوون و تۆژینەوەکانی دەستەی یەکەم ڕاوەستان لەم زانایانە پێکهاتبوو: برۆنۆ، ستراوس، ئێدگار باوەر، موسس هێس، فیۆرباخ، کارڵ مارکس و فردریک ئێنجلس. ئەم دەستەیە هەوڵیاندالۆجیکی دیالێکتیک بە واقعی بەردەستەکییەوە ببەستنەوە و بەرگە ئایدیالیست و ئایینییەکەش لەبەر فەلسەفەی مامۆستاکەیان داماڵن.

ناکۆکیی نێوان ئەم دوو دەستەیە لەوێدا گەورەتر بوو کە ستراوس پەرتووکەکەی (ژیانی مەسیح) و فیۆرباخ (ناوەڕۆکی مەسیحایەتی)یان بڵاو کردەوە. ئەم دوو زانایە لە بۆچوونێکی دیالێکتیکی و ماتەریالیستانەوە پەلاماری ئایینی مەسیحییان داوە و لۆجیکمەندانە بناغەکەی دەڕووخێنن. ستراوس، لەم پەرتووکەدا، (کەرامەتەکانی) مەسیح بە ڕووداوێکی نادروست و ناماقووڵ دادەنێت، کە لە دیدی ئەمەوە ڕاست نین و شاگردەکانی مەسیح بۆ ترساندنی خەڵکی و مەزنکردنی کەسایەتیی مەسیح هەڵیانبەستوون. (فیۆرباخ)یش ڕەفزی بوونی ئۆنتۆلۆجییانەی خوا دەکات و ئایینی بە شێوازێکی (نامۆیی) داناوە.

جگە لەمە، هیگڵییە چەپڕەوەکان هەوڵیانداوە لەسەر بناغەی لۆجیکە دیالێکتیکەکە کە هەرگیز تیۆری یان پراکتس ناکات بە قوربانی لایەنەکەی تر، پەیوەندیی نێوان تیۆری و پراکتس پتەوتر بکەن. لەو باوەڕدا بوون کە هەتا ئەم پەیوەندییە نەبەسترێت ئەوا فەلسەفە یان تیۆری توانا و بڕستی گۆڕانی واقعی بەردەستەکی نابێت و لە قاوغی فۆرمەلیستیدا دەرناچێت. ئەم خاڵەش لەدواییدا بوو





بە یەکێک لە کێشە گرنگەکانی فەلسەفەی مارکس و مارکس بەئاشکرا لە نووسراوەکەیدا لەمەڕ فیۆرباخ لەم کێشەیە دواوە و بایەخێکی زۆری پێداوە.

لە سەدەی ڕابردوودا (سەدەی بیستەم) فەلسەفەی هیگڵ جارێکی دی هاتە گۆڕێ و گەلێک لە زانایان وەکوو دلّتی و کرۆشۆ و کۆجێف و برادلی و مالّتاگەر و جۆن دیوی و ژان پۆل سارتەر گەڕانەوە بۆ بیروباوەڕەکانی و سوودیان لێ وەرگرتوون. پاش سەرهەڵدانی نازیزم لە ئەڵمانیا، هەندێک لە زانایان وەکوو کارڵ پۆپەر پەلاماری فەلسەفەی هیگڵی دا و لە دیدی ئەم زانایەوە نازیزم منداڵی فەلسەفەکەی هیگڵە و نازیزم سوودی لە هیگڵ وەرگرتووە. بە پێچەوانەی ئەمانەوە، هەندێک زانای دی وەکوو هربەرت مارکۆز لە پەرتووکەکەیدا (هۆش و شۆڕش) بەرگری لە هیگڵ دەکات و سیستەمی فەلسەفەکەی بە پێشکەوتنخواز دادەنێت، کە بە هیچ شێوەیەک ڕێگە بە خۆی نادات ڕژێمێکی فاشیستی پاشکەوتوو سوودی لێ وەربگرێت. مارکۆز لە هەمان شوێندا پەنجەی تاوانباری بۆ فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم ـ کە کارڵ پۆپەر یەکێکە لەوانەی باوەڕ بەم فەلسەفەیە دەکات ـ ڕادەکێشێت و ئەم فەلسەفەیە دەکات بە بناغە بۆ سەرهەڵدانی ئایدیۆلۆجیای نازیزم لە مێژووی ئەورووپادا. بێگومان، ئەم زانایانە کە ڕەخنە لە هیگڵ دەگرن یان بەرگری لێ دەکەن، بەڵگە و بۆچوونی خۆیان هەیە کە لە بواری پێشەکی ئەم نووسراوەدا نییە تاکو بە درێژی و بە وردی ئاماژەیان بۆ بکەین.

خوێنەری بەڕێز

وەکوو دەزانن نووسین لەمەڕ زەخیرەیەکی هێندە دەوڵەمەندی فەلسەفییانە و فەیلەسووفێکی وەکوو هیگڵ کە لە مێژووی فەلسەفەدا مشتومڕی زۆری لەسەر کراوە، کارێکی ئاسان نییە. من هەوڵمداوە





مـەوزوعـیـانـە بیـروبـاوەڕەکـانـی لێک بـدەمـەوە، تاکـو ڕادەیەکـیش تۆژینەوەکەم لە شێوازێکی ئەکادیمیدا بهێڵمەوە. لە هەمان کاتیشدا ویستوومە ئەو خوێنەرە بەڕێزانەی شارەزایی ئەوتۆیان لە فەلسەفەدا نییە لەم نووسراوە بگەن و سوودی لێ وەربگرن. جگە لەوەی ئەم کارە لە بواری نووسینی فەلسەفییانەدا گرانە. لە لایەکی ترەوە یان لە دیدی منەوە لە هەموویان سەختتر دۆزینەوە و داتاشینی ئەو واژە فەلسەفییانەن کە لە زمانی فەلسەفیی جیهانیدا هەن و لە زمانەکەی ئێمەدا پەیدا نەبوون. من هەوڵمداوە ئەوەی مەبەستمە ڕوون و ئاشکرا لێکی بدەمەوە، هەرچ کەموکورتییەکیش لەم ڕووەوە لەم نووسراوەدا هەبێت، چاوی لێ مەپۆشە و ئازادانە بیروڕای خۆتی لەسەر دەرببڕە. هەموو فۆرمێکی فەلسەفە و ئەدەب و هونەر لە ئاسمانی ئازاد و لەحەدبەدەر و ڕەخنەبازیدا گەشە دەکات و پێش دەکەوێت.

د. محەمەد کەمال

ماڵبۆرن



# گەشەکردنی بیروباوەڕی هیگڵ

گەلێک لە شارەزایانی فەلسەفەی هیگڵ، کە دێنە سەر تۆژینەوەی ئەم شێوە فەلسەفییە، لە لۆجیکی دیالێکتیکەوە گەشتەکەیان بە ڕێ دەخەن. هەڵبەتە ئەم کارە هۆکار و مەبەستی خۆی هەیە، چونکە هیگڵ لۆجیکی دیالێکتیکی کردووە بە بنەما و ڕەورەوەی سستەمە فەلسەفییەکەی. ئێمە لێرەدا لەگەڵ دید و ڕای هیگڵ و ئەو شارەزایانەداین، کە لۆجیکی دیالێکتیک بە پێشتر دەدانێین، بەڵام لە هەمان کاتدا بە پێچەوانەی ئەمانەوە لە ڕوانگەیەکی ترەوە هێگڵ بە خوێنەری کورد دەناسێنم و هەوڵ دەدەم ئەو لایەنانە بخەمە بەر چاو، کە پەیوەنییەکی ڕاستەوخۆیان بە ژیانی کۆمەڵەوە هەیە و کارتێکردنێکی پۆزەتیڤی یان نێگەتیڤیشیان کردووەتە سەر فێرگە فەلسەفییەکانی پاش هیگڵ.

سەردەمی هیگڵ (١٧٧٠-١٨٣١) لانکەی زۆرانبازیی هێزە ناکۆکە ڕامیاری و کۆمەڵایەتییەکان بووە. لەو ساڵانەدا بوو کە شۆڕشی بورجوازیی فەرەنسا دەسگاکانی ڕژێمی دەرەبەگایەتی ڕووخاند و بزووتنەوەی تەنویر و مۆدێرنتی (تازەگەری) کۆتاییان بە دۆگمای ئایین هێنا. ئەم بارودۆخەی ئەوروپا، ڕاستەوخۆ، کاریان کردووەتە سەر بیرکردنەوەی هیگڵ و ئەمیش وەکوو ڕووناکبیرێکی بێترس، بە نیازی ئەوەی لە سەردەمەکەی خۆی بگات، خۆی لە هەموو بوارێکی فەلسەفی داوە. شۆڕشی بورجوازیی فەرەنسا، لەسەرەتاوە، بۆ هیگڵ ئومێدێکی گەورە بووە. بەم ئومێدەوە و بەو بڕوایەی کە تیشکی ئەو شۆڕشە بتوانێت ڕۆشناییەکی گەورە لە شەوی تاریکی ژیانی ڕامیاری و کۆمەڵایەتیی ئەڵمانیادا دروست بکات و بەگەرمییەوە پێشوازیی

شۆڕشـەکە و ڕۆڵی ناپلیۆنی کردووە و کاتێکیش ناپلیۆن ئەڵمانیای داگیرکرد، بە پێچەوانەی ئەوانەی بەرگرییان کرد و دژی داگیرکردنی ئەڵمانیا وەستان، هیگڵ ناپلیۆنی بە دۆستی ئەڵمانیا داناوە، چونکە دەستگا کۆن و سواوەکانی ڕژێمە دەرەبەگایەتییەکانی لەناو ئەڵمانیادا بۆ ئەڵمانەکان ڕووخاند. ناپلیۆن لە ساڵی ١٨٠٦دا لەشکری پروسیای شکاند و ساڵێکیش پاش ئەو شاری (جینا)ی، ئەو شارەی هیگڵی تێدا دەژیا، داگیرکرد. هەر لەو ساڵەشدا بوو لە ژێر دەنگی تۆپ و گوللەبارانی لەشکری فەرەنساییدا هیگڵ دوالاپەڕەکانی پەرتووکە مەزنەکەی (فینۆمینۆلۆجی هۆش) ئەنووسییەوە و گەیشتیشە ئەو باوەڕەی کە ئەم ڕووداوە بتوانێت مێژووی شارستانیەتیی ڕۆژئاوا بە دواقۆناغی پێشکەوتن بناسێنێت. لەو ساڵەدا لە یەکێک لە نامەکانیدا بۆ نیتەمەر (Nithammer)ی هاوڕێی، ناپلیۆنی بە هێزی پاک و ڕزگارکەر داوەتە قەڵەم.[١]

لە کاتی شۆڕشی فەرەنسادا، تەمەنی هیگڵ نۆزدە ساڵان بوو. گوایا، بۆ یادکردنەوەی شۆڕشەکە هیگڵ و شیلنگ و هۆڵدرلین،[٢] لە دەرەوەی شاردا نەمامی ئازادییان ڕواندووە. کاتێکیش ناپلیۆن هاتە سەر تەخت هیگڵ ٣٣ ساڵان بوو. بەڵام پاش ئەمە هیگڵ بە دڵشکاوییەوە پاش بینینی کەموکورتییەکانی شۆڕشەکە و ڕژێمی بوجڤوا، کەوتە ناو گۆمی نائومێدییەوە و لافیتە ڕەنگاوڕەنگەکانی شۆڕشی بە بێمانا دەهاتە بەر چاو و ڕژێمی بورجوازی بە شێوازێکی نوێ بۆ چەوساندنەوە دادەنا. بەم جۆرە، هیگڵ ئومێدی بە شۆڕش نەما و هێزێکی بەدیلیشی نەدەبینی، لەبەر ئەم هۆیەش پەنای بردە بەر ڕژێمی پاشایەتیی ڕیفۆرمیستی.

لە ساڵی ١٨١٨دا هیگڵ کرا بە سەرۆکی زانکۆی بەرلین و پشتگیریشی لە ڕژێمی فردریکی سێیەم کرد. هەر لەو ساڵەشدا بوو

ئازادیی نووسین و بیــــردەربڕین لە زانکۆدا قـــەدەغـــە کـــرا. ئەم هەڵوێســـتـــەی هیگڵ وەکـــوو هەڵەیەکی ڕامـــیـــاری کـــە چەند لە فەیلەسووفەکانی تریش لە مێژوودا وەکوو ئەفلاتون و هایدیگر تووش بوون، بووە بە داردەستێک بۆ دوژمنانی هیگڵ و دژی بیروباوەڕەکانی بەکارهێنراوە. شۆپنهاوەر لە پێشەکی پەرتووکەکەیدا (*The World as Will and Idea*) بە ئـاشـکـرا پـەلامـــــاری هـیـگـڵـی داوە و بـە زانـای هەلپەرست و بازرگانی داناوە.[٣]

زانکۆی بەرلین یەکەم جێگای ئەزموون و مـامـۆسـتـایەتیی هـیگڵ نەبوو. هیگڵ، لە پێش هاتنیدا بۆ ئەم شـارە، لە چەند شـوێنێکی تر مـامۆسـتـایەتی کردووە. کاتێک فیختە (Fichte) بە تاوانی گۆمڕایی لە زانکۆی جـینا دەرکـرا، هیگڵ لە شـوێنی ئەو بە مـامـۆسـتـا دانرا. لەسـەرەتادا زۆر لە پرۆفیسـۆرەکـان بە دامـەزراندنی هـیگڵ دڵـخـۆش نەبوون. لەو باوەڕەدا بوون کە مرۆڤێکی (شوابی) خوارووی ئەڵمانیا ناتوانێت خـۆی لە بواری فـەلسـەفـە بدات. لە هەمـان کـاتدا بەرهەمـە بڵاوکـراوەکـانی لە گـۆڤـاری (*The Critical Journal of Philosophy*)دا سەرنجی ڕۆشنبیرانی بە لای خۆیاندا ڕانەکێشا.[٤]

گۆیتە و شیلەر لەنزیکەوە هیگڵیان دەناسی، بەڵام لە نووسینەکانی ڕازی نەبوون.[٥] شـیلەر لە سـاڵی ١٨٠٤دا لە نامـەیەکـدا بۆ براکـەی دەنووسێت: "نامـەوێت کاتی خـۆم بە نـووسینەکانی هیگڵەوە بە فیـڕۆ بدەم."[٦] سەرەڕای لاوازیی نووسینە سەرەتاییەکانی، هیگڵ کەوتبووە ژێر کـــارتێکـردنی شـــێــــڵنگەوە، تەنانەت زۆر کـــەس نەیدەتوانی نووسینەکانی شیڵنگ و هیگڵ لە یەکتر جیا بکەنەوە.

کاتێکیش شـیـڵنگ واز لە مـامـۆسـتـایەتی دەهێنێت بە ڕێکەوت لە شوێنێکدا یەکێک لە شاگردەکانی هیگڵ دەبینێت و گلەیی لەلا دەکات، گوایە ئەوەی هیگڵ باسی دەکات و بە فەلسەفەی خۆی دادەنێت مافی هیگڵی پێوە نییە و خاوەنی ڕاستەقینەی شیڵنگە.[٧]





بەکورتییەکەی، گۆڕانە تراجیدییەکانی شۆڕشی فەرەنسا، بوونە هۆی پاشگەزبوونەوەی هیگڵ لە هەڵوێستی ڕادیکالانەی و تاکو مردیش بە فەیلەسووفێکی سەر بە دەوڵەت دادەنرا.

لە سەردەمی ئەم فەیلەسووفەدا بزووتنەوەی تەنویر و ڕۆمانتسیزم گەلێک لایەنی فەلسەفییانە و هونەری داگیر کردبوو. ڕابەڕانی بزووتنەوەی تەنویر لەبەر ڕۆشنایی هۆشدا لە مەسەلەکان دەکۆڵینەوە و هەوڵیان دەدا مرۆڤ لەناو شەوی تاریکی دۆگمای ئایینەکان دەرباز بکەن. ڕۆمانسییەکانیش پەنایان دەبردە بەر سۆز و عاتیفە و زاتی مرۆڤیان دەگەیاندە پلەیەکی بڵند و بە چاوگی مەسەلەکانیان دادەنا. بە دیدی هیگڵ هەڵکردنی چرای هۆش کارێکی مەزن و شۆڕشگێڕانەیە، بەڵام، لە هەمان کاتدا، لەو باوەڕەدا بوو کە پێویستە هۆش ڕۆڵێکی پراگماتیکی هەبێت. هەروەها دەبێت ژیانی کۆمەڵایەتی و دادپەروەری ببەستێتەوە بە تێڕوانینە میتافیزیکییەکانەوە و هیچ لایەکیان نەکات بە قوربانی لایەنەکەی تر. هیگڵ باوەڕی بە سیستەمێک هەیە کە ژیانی ئەمڕۆ و سبەینێ (جیهانی گیانەکی) پێکەوە ببەستێتەوە. بزووتنەوەی ڕۆمانسیەتیشی بە ناتەواو دادەنا و وا بۆی دەچوو کە نابێت تێکۆشانی مرۆڤ لەسەر ئەم ئەستێرەیە بە بێهوودە و بێ مانا دابنرێت. پێویستە زاتی ڕەها لە ڕێگای هۆشەوە، نەک سۆز و عاتیفەوە، لەگەڵ بوونی مرۆڤدا یەک بگرن. هیگڵ لە ساڵی ١٨٠٢دا نووسراوێکی بە ناوی (بڕوا و زانیاری) بۆ ئەم کێشەیە تەرخان کردووە و لەم نووسراوەدا ڕەخنە لە بزووتنەوەی تەنویر و ڕۆمانتسیزم دەگرێت.

سەرەڕای کارتێکردنی ئەم بزووتنەوانە، کێشە ناکۆکییەکانی ناو فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانیش، کە پێڕەوی سیستەمی دووالیزمی (کانت)ی دەکرد، هاندەرێکی تر بوون بۆ بەرەوپێشەوەچوونی





بیروباوەڕی هیگڵ. با لێرەدا بزانین ئەو کێشە ناکۆکییانەی ناو فەلسەفەی کلاسیکیی ئەڵمانیا چین؟

ئیمانوئیل کانت (١٧٢٤–١٨٠٤) لە پەرتووکە مەزنەکەیدا *Critique of Pure Reason* (١٧١٨) بەو نیازەوە کە میتافیزیک وەکوو زانستەکانی تر پێش بخات، گەیشتە ئاکامێکی نالەبار و نێگەتیڤانە. ئەم پەرتووکە کە لە سێ بەش پێکهاتووە، لەسەرەتاوە ــ لە بەشی یەکەمدا ــ هەوڵ دەدات ئەو هەلومەرجە پێویستانە بۆ تاقیکردنەوەی هەستەکی بدۆزێتەوە. بێگومان، کانت، وەکوو دایڤید هیوم، تاقیکردنەوەی هەستەکی بە یەکەم سەرچاوەی زانین دادەنێت، بەڵام مەبەستی ئەو تۆژینەوە لەسەر چۆنیەتیی ئەم جۆرە زانینە نییە و هەوڵ دەدات مەرجە پێویستەکانی تاقیکردنەوەی هەستەکی بدۆزێتەوە. بۆ نموونە: هەر تاقیکردنەوەیەکی هەستەکی ڕوو بدات، ئەوا پێویستە ئەم تاقیکردنەوەیە لەناو کات و شوێندا بێت. کات و شوێن، کە خۆیان لەناو تاقیکردنەوەماندا نین، کەس ناتوانێت لە ڕێگای تاقیکردنەوەی هەستەکییەوە بیانناسێت، دوو مەرجی پێویست و پێشترن (aprior) بۆ هەموو تاقیکردنەوەیەکی هەستەکی. کانت، لە بەشی یەکەمی پەرتووکەکەیدا، ئەم دوو مەرجە لەپێشترەی بۆ دۆزیوینەتەوە. لە بەشی دووەمدا لە ڕێگای (کاتیگۆرییەکان)ی ناو توانای تێگەیشتن ئەو کەرەسە خاوانەی لە ڕێگای هەستکردنەوە گەیشتوون، کۆیان دەکاتەوە و (بیر)یان لێ پێک دەهێنێت. لەم بەشەشدا ئەو کاتیگۆرییانە کە ژمارەیان دوانزەیە و لە لۆجیکی ئەریستۆوە وەریگرتوون، بوونەتە پێشمەرج بۆ تێگەیشتن (Understanding). مەبەستی پرۆژە فەلسەفییەکەی کانت بە ڕێگای ڕەخنەبازییەوە، بەستنەوەی فێرگەی هەستەکی و هۆشەکییە. زاناکانی سەر بە فێرگەی هۆشەکی (Rationalism) زانینیان گەڕاندووەتەوە بۆ هۆش و تاقیکردنەوەی





هەستەکی بە کەم و کورت دادەنێن. بۆ نموونە: ڕێنە دێکارت (١٥٩٦–١٦٥٠) کە بە ڕابەری فەلسەفەی نوێ دادەنرێت و زانایەکی سەر بە فێرگەی هۆشەکییە، هۆش دەکات بە تاکەسەرچاوەی زانینە لەگومانبەدەرەکان و لەو باوەڕەشدا بوو، کە هۆش خاوەنی دەستەیەک بیری زکماکییە (Innate Ideas) و لە کاتی خوولقاندنی مرۆڤدا، خوا ئەم بیرانەی لەناو هۆشدا داناوە، کە مرۆڤ دەتوانێت بە هۆی ئەم بیرانەوە گەلێک ڕاستەقینە بناسێت. بۆ نموونە: بە دیدی دێکارت، بیری بوونی خوا زکماکییە و هەموو تاکێک بەو بیرەوە هاتووەتە ژیانەوە.

پێشەوایانی فێرگەی هەستەکی، وەکوو جۆن لۆک و دایڤید هیوم و بارکلی، ڕەفزی بوونی هۆش دەکەن و زانین بۆ تاقیکردنەوەی هەستەکی دەگەڕێننەوە. هیوم، بۆ نموونە، هۆشی مرۆڤ بە قاوغێکی بەتاڵ دادەنێت، کە هیچ جۆرە زانینێکی لەگەڵ خۆیدا بە زکماکی هەڵنەگرتووە. لە دیدی ئەم زانایەوە هەستکردن دوو جۆری هەیە: ئینتباعەکان (Impressions) و بیرەکان (Ideas). ئینتباعەکان پێش بیرەکان دەکەون و هەر بیرێکمان هەبێت ئەوا لە ئینتباعەکەیەوە پەیدا بووە.[8] شیرینیی هەنگوین لە ئینتباعی تامی هەنگوینەوە پەیدا دەبێت. ئەگەر ئێمە تامی هەنگوین نەکەین، یان کەس تامی هەنگوینی نەکردبێت، ئەوا نازانین هەنگوین چی جۆرە تامێکی هەیە. لەئەنجامدا، بیرەکان بەبێ ئینتباعەکان دروست نابن.[9] ئەگەر بیرێکمان هەبێت و ئینتباعەکەیمان نەبێت، ئەوا ئەو بیرە بێ مانایە و جێگای متمانە نییە. زۆر بیری لێکدراویش، وەکوو ئەسپی باڵدار، ڕووباری هەنگوین و... هەن کە لە ئینتباعە وردەکانیانەوە وەکوو (ئەسپ، باڵ، ڕووبار، هەنگوین و...)ەوە پەیدا بوون و توانای خەیاڵ و ئەندێشەمان ئەم بیرە وردانەی بەستوە بەیەکەوە.[10]





بۆچوونە ئەپستمۆلۆجییەکەی هیوم بنەمای بیروباوەڕی میتافیزیکی و ئایینەکان دەڕووخێنێت. هەتاکو ئینتباعی بوونی خوا، گیان یان هۆشمان نەبێت، ئەوا بیری ئەم جۆرە بوونانەش بێ مانایە و بێ بناغەیە. کانت، وەکوو شارەزایەکی بلیمەت، بەوردی دەستی کردووە بە نەخشەکێشانی ئەنەتۆمی زانین. فەلسەفەکەی بە ڕەخنەکار دادەنرێت، چونکە بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە دەیڕوانییە کێشەکانی ئەم دوو فێرگەیە. ئەو پرسیارەمان لێ دەکات، کە ئایا چی دەزانین؟ زانایانی فێرگەی هۆشەکی، وەکوو پێشتر باسمان کردن، لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا دەگەڕێنەوە بۆ هۆش و هەمووشیان لەو باوەڕەدان کە هۆش ناوەڕۆکێکی لە(ماتەر)بەدەرە و دەتوانێت لە پاش تێکشکانی لەش بمێنێتەوە و کاری خۆی بکات. هەروەها بە دیدی ئەم زانایانە شێوەی زانینی هۆشەکی هەمەکین (Universal) و گۆڕانیان تیادا ڕوو نادات، چونکە بە بابەتە بەردەستەکییەکانەوە نەبەستراونەتەوە. بۆ نموونە (٢+٢) دەکاتە (٤) و بەگوێرەی گۆڕانکاریی ناو کات و شوێن گۆڕانی بەسەردا نایەت و هەمیشە دەکاتە (٤).[١١] زانینە هەستەکییەکانیش کە پەیوەندییان بە بابەتە بەردەستەکییەکانەوە (وەکوو کورسی، مێز، درەخت و پشیلە و...) هەیە، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر، دەگۆڕێن. با بڵێین وا هەست دەکەم ئەمڕۆ هەوا گەرمە. لەوانەیە، لە هەمان کاتدا، بۆ مرۆڤێکی تر سارد بێت. یان ئەمڕۆ گەرمە و سبەینێ ساردە. لەم حاڵەتەدا پرۆپۆزیشنی "ئەمڕۆ هەوا گەرمە." ئاماژەی ڕاستەقینەیەکی هەندەکی دەکات. زانا هۆشەکییەکان پشتیان بەم شێوە زانینە نەبەستووە و بۆیە پەنایان بردووەتە بەر فۆرمە هەمەکییەکان.[١٢]

وەکوو باسمان کرد، هەڵوێستی کانت لە ئاستی ئەم دوو فێرگەیەدا





ڕەخنەگـــرانەیە. بڕوای وایە هـۆش بە تـەنیـــا و بـەبـێ یاریدەدانی هەسـتکردن ناتوانێت خـەسـڵـەتەکانی جیـهـانی دەرەوە بناسـێت، بە هەمان شـێوەش ئەگەر هۆش نەبێت خـەسڵەتەکانی جیهانی دەرەوە کۆ بکاتەوە و بیریان لێ پێک بهێنێت، ئەوا زانین نابێت. هۆش و هەست تـەواوکـــەری یـەکـــتـــرین، "بیـــرەکـــانمان بەبـێ ناوەڕۆک پووچەڵن، هەستکردنیش بەبێ ئەو بیرانە کوێرن و هیچ نابینن."[١٣] با ئاگاداری ئەو خـاڵەش بین کـە هۆش لای کـانت وەکـوو هۆش لای دێکارت نییـە، چونکە هۆش لای کـانت بیـری زکـمـاکی لـەگـەڵ خـۆیدا نەهێناوەتە وجـودەوە و گـومـانیش لە بوونی هۆشـێکی لە(مـاتەر)بەدەر دەکـات. سەرەڕای ئەمـەش موتوربەکردنی دوو قودرەتی زانین (هۆش و هەست) لە یەک زەمـینـەدا بۆ گـەلێک لایەنی ترمـان دەبات. یەکـێک لەوانە پەیوەندیی نێوان زانینی هەمـەکی و هـەندەکـییـە. ڕابەرانـی فـێرگـەی هـەسـتـــەکی زانینی هـەندەکی بە بـنـەمـــا دادەنێن و بڕوایان بـە مـەوزوعیـەتی چەمکە هەمـەکییەکان نییە. با ئەوەشمان لە بیر نەچێت کـە ئـەریسـتـۆ (٣٨٤-٣٢٢ پێش زایین) لە پێش جـۆن لۆک و هـیـوم و کـانتدا ئاماژەی ئەم کـێشـەیەی کردووە و فـۆرمـە هـەمـەکـییـەکـانی ئەفلاتونی (٤٢٨-٣٤٧ پێش زایـین) لە ئاسمانەوە داگرتۆتە سەر زەوی و لە جیهانی ماتەریالدا جێگەی بۆ کردوونەتەوە. کانت و هیگڵیش، لەم ڕووەوە، پـێـــڕەوی ئـەریـســـتـــۆیان کـــردووە و فـــۆرمـــە هـەمـــەکـی و هەندەکییەکانیـان پێکەوە گرێداوە. ئەریستۆ لەم بارەیەوە دەڵێت، ئەگەر بمـانـەوێت ڕەنـگـی زەرد بـنـاسـین، ئـەوا دەبـێت پـەنـجــــە بـۆ بـابـەتـێـکی بەردەسـتـەکیی زەرد ڕابکێشـین. ئەگینا نازانین زەرد چییە و (زەردی) وەکـوو ڕەنگ بەبـێ بابەتە زەردەکان نییـە. بە هـەمـان شـێـوەیش بابەتە بەردەسـتـەکییـەکان بەبێ خـەسڵـەتە هەمـەکییـەکانیـان نین و نابن.[١٤] هـەرچـەندە بۆچوونـەکـەی کـانت ئەریسـتـۆیانەیە، بەڵام کـانت وەکـوو





ئەریستۆ باسی گرنگیی ئەم کێشەیەی بۆ سیستەمی ئۆنتۆلۆجی نەکردووە و زیاتر هەوڵیداوە لە کێشەی ئەپستمۆلۆجی بکۆڵێتەوە. کانت پێڕەوی هەردوو فێرگەی هۆشەکی و هەستەکی کردووە و ڕەفزی هیچیان ناکات. بە دیدی ئەم زانایە هەستکردن ئەرکێکی گەورەی لەسەر شانە و هەمیشە خەریکی پەیداکردن و دۆزینەوەی خەسڵەتی بابەتەکانی دەرەوەیە و دەیانگەیەنێت بە هۆش. ئەمەش ئەوە ڕادەگەیەنێت کە هەرچەندە کانت ئایدیالیستانە بیر دەکاتەوە، بەڵام وەکوو ئەفلاتون و بارکلی جیهانی ماتەریاڵ بە ساختە دانانێت و زانینی هەستەکی ڕەفز ناکات. باوەڕیشی وایە کە هۆش وەکوو لایەنێکی تر ڕۆڵی گرنگ و تایبەتی خۆی هەیە. زات و جیهانی دەرەوەی زات، بەگوێرەی فەلسەفەی کانت، دوو ڕاستەقینەی جیاوازن و بەرانبەر یەکتر وەستاون. زات دەیەوێت جیهانی دەرەوە بناسێت و ناوەڕۆکی بدۆزێتەوە، بەڵام بە حوکمی ئەوەی توانای زات وابەستە بە هۆش و هەستەوە و ئەم دوو قودرەتەش کەمهێزن و ناتوانن ناوەڕۆکی بوون بناسن.

دروستە کانت دەوری هەستەکانی فەرامۆش نەکردووە، بەڵام بە زانایەکی سەر بە فێرگەی هەستەکی دانانرێت. وابەستەکردنی هۆش و هەستیش بەیەکەوە، دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی توانای هۆش، چونکە هەتاکو هەستەکان خەسڵەتەکان جیهانی دەرەوە بە هۆش نەگەیەنن، ئەوا هۆش بیرەکان پێک ناهێنێت. ئەوەی هەستکردنیش بە هۆشی ڕادەگەیەنێت، خەسڵەتی بابەتە بەردەستەکییەکانە و هەرگیز ناتوانێت خۆی بگەیەنێتە ئەودیو ئەم بابەتانەوە و لایەنە نادیار و شاراوەکانی بدۆزێتەوە. لێرەدا کانت ڕەفزی جیهانی نادیار ناکات، بەڵکە دەڵێت ئەوەندەی لەبارەوە دەزانێت کە هەیە، بەڵام هیچی تری لەبارەوە نازانێت. لەم بۆچوونەوە، جیهانی کردووە بە دوو بەشەوە:





١- جیهانی فینۆمینه (Phenomenon)

٢- جیهانی نومینه (Noumenon)

جیهانی فینۆمینه زانراوه و دەکەوێته بەر ڕۆشنایی هەستکردن و کاتیگۆرییەکانی تێگەیشتن. نۆمینەش کە جیهانێکی لە(ماتەر)بەدەرە، لەودیو فینۆمینەوەیە و هەرگیز مرۆڤ نایناسێت و تۆزقاڵێکی لەبارەوە نازانێت. زانین سنووری دیاریکراوی هەیە و توانا و برستی هەستکردن و کاتیگۆرییەکانی ناو تێگەیشتن مەحدوودی دەکات. ئەم پابەندییە دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە ئەگەر ڕاستەقینەیەکیش لەودیو جیهانی فینۆمینەوە هەبێت، ئەوا مرۆڤ ناتوانێت بیناسێت. لەبەر ئەم هۆیەیە (کانت) ڕەفزی ئەو بەڵگە فەلسەفییانە دەکات، کە بۆ سەلماندنی بوونی خوا دامەزراون و فەیلەسووفە ئایدیالیستەکان لە ئەریستۆوە تا زانا مەسیحییەکان و موسوڵمانەکان و دیکارت و لایبنیز بەکاریان هێناون.[١٥]

کێشە دوالیستییەکەی کانت، بەتایبەتی هەڵچنینی دیوارێکی ئەستوور لەنێوان جیهانی فینۆمینە و نۆمینەدا و لەنێوان زات و جیهانی دەرەوەدا، سەرەڕای ئەمەش پابەندکردنی توانا و برستی زانینی مرۆڤ بوونەتە هۆی دەربڕینی نارەزایی فەیلەسووفە ئەڵمانییەکانی پاش کانت. شۆپنهاوەر و فیختە و یاکۆبی و شلایەماخەر و شیلنگ و شیلەر و هیگڵ هەوڵیانداوە چارەسەری ئەم کێشە دووفاقییە بکەن. ـ با ئەوەشمان لە یاد نەچێت، کە کەموکورتیی بۆچوونەکانی کانت لەوەدایە کە ئەم فەیلەسووفە زۆر خۆی لە زانستەوە نزیک کردووەتەوە و زانینی بەستووەتەوە بە واقعی بینراوەوە و ئەوجا، لە هەمان کاتدا، بە شێوازێک کە هەرگیز لەگەڵ ئەم هەڵوێستە زانستییەدا ناگونجێت، جیهانێکی نەبینراوی لە بەردەمماندا سەپاندووە کە نەیتوانیوە بەو زانینە زانستییەوە بوونی ساغ بکاتەوە.





با بزانین زانایانی پاش کانت چۆن چارەسەری ئەم کێشەیەیان کردووە.

شۆپنهاوەر یەکەم فەیلەسووفی ئەم کاروانەیە کە هەوڵی داوە چارەسەری ئەم کێشە دووالیستییە بکات. بۆ ئەم کارەش، شۆپنهاوەر، جیهانی نومینەی بەو ئیرادە هەمەکییە (Universal will) داناوە، کە بە بەردەوامی خۆی دەردەخات و دەبێت بە فینۆمینە و ژیانیش بە هەموو بوونەوەرەکان دەبەخشێت. بەگوێرەی شۆپنهاوەر فینۆمینە و نۆمینە دوو ڕاستەقینەی لە یەکتر دوور و جیاواز نین، بەڵکو فینۆمینە فۆرمی دەرەکی و ڕووالەتی نۆمینەیە (ئیرادەی هەمەکی). ئەوجا بە ناسینی خۆمان و بابەتەکانی دەوروبەرمان و ئەو واقعەی تیایدا دەژین تاکو ڕادەیەک ڕاستەقینەش یان (نۆمینە) وەکوو کانت دەڵێت، دەناسین. بەڵام مەحاڵە مرۆڤ زانیارییەکی پڕ و تەواوی لەبارەیەوە هەبێت، چونکە ئەو بەشێکی هەرە بچووکی ئەو ئیرادە هەمەکییەیە و ناگاتە ئەو ئاستەی هەموو شتێ لەبارەیەوە بزانێت.[١٦] فریدریک هاینریخ یاکۆبی (١٧٣٤-١٨١٩) وەکوو شۆپنهاوەر تەماشای کێشەکەی نەکردووە و لە بۆچوونێکی ئایینی و سۆفیگەرانەوە ناسینی جیهانی نۆمینەی بە شعورەوە (Feeling) بەستۆتەوە. فریدریک ئێرنست شلایەماخەر (١٧٦٨-١٨٣٤) لەگەڵ یاکۆبیدا هاوڕایە و لەو باوەڕەدایە، کە ئەو شعورەی یاکۆبی ئاماژەی بۆ کردووە شعورێکی ئایینییە، یاخود شعورکردنە بەوەی بوونەوەرێکی بەدەستەڵات هەیە ئاگای لە بارودۆخی مرۆڤ بێت و لە کاتی ناخۆشی و تەنگانەدا فریای بکەوێت.[١٧] هەر ئەم ڕایەش بوو وای لە هیگڵ کرد ڕەخنە لە شلایەماخەر بگرێت و بڵێت: "بە ڕای شلایەماخەر سەگێک دەتوانێت ببێت بە کاسۆلیکییەکی چاک."[١٨]

شیلەر و شیڵنگ لە ڕووانگەی هونەرەوە ڕوانیویانەتە کێشەکە.

وەکوو دەزانین، هیچ دیوارێک لەنێوان زات و بابەتەکەیدا لە ئەزموونی هونەریدا نییە. هونەرمەند ڕاستەوخۆ دەچێتە ناوجەرگەی بابەتەکەیەوە و یان بابەتەکەی لەناو زاتیدا لە دایک دەبێت و هەموو شتێکیشی لەبارەیەوە دەزانێت. بیروڕای ئەم دوو زانایە تازە نییە، کانت لە پێش ئەماندا لە پەرتووکی سێیەمدا (*Critique of Judgement*) باسی پەیوەندیی نێوان زات و بابەتی هونەری کردووە و هەر لەبەر ئەم هۆیەشە لە کاری هونەریدا زاتی هونەرمەند بە زاتێکی نامۆ دانانرێت، نامۆیی لەو حاڵەتەدا پەیدا دەبێت، کە بابەتە هونەرییەکە لە زاتی هونەرمەند جیا دەبێتەوە و دەبێت بە موڵکی کەسانی دیکە.

فیختە (١٧٦٢-١٨١٤) بە پێچەوانەی ئەم زانایانەی باسمان کردن خۆی بە ئایین و هونەرەوە خەریک نەکردووە و هەوڵی داوە زەمینەیەکی فەلسەفییانە بۆ پەیوەندییەکانی نێوان زات و بابەت خۆش بکات. بەڵام نالەباری سیستەمەکەی لەوەدایە کە فیختە ڕەفزی مەوزوعیەتی جیهانی دەرەکی دەکات و بە پاشکۆی زاتی دادەنێت، جۆرج لۆکاش لەم بارەیەوە دەڵێت: "فیختە فەلسەفەکەی کانتی لە ماتریالیزم دوور خستۆتەوە و بەرگێکی ئایدیالیستی کردووە بە بەردا."[١٩] لە دیدی فیختەوە، ئەوەی هەیە، چی ماتەر یان لە ماتەربەدەر، ڕووی ناوەوە و دەرەوە، فینۆمینە و نۆمینە زات و فۆرمی دەرەکیی زاتە. کەوابوو ناسینی جیهان بۆ زات کێشەیەکی گران، یان مەحاڵ، نییە. زات چۆن خۆی دەناسێت بەو شێوەیەش جیهانی دەرەکی دەناسێت، چونکە جیهانی دەرەکی دیوی دەرەوەی خۆیەتی و بۆ ئەو بێگانە نییە. ئەم هەنگاوەی فیختە بە دیدی هیگڵ کارێکی خراپ نییە، بەڵام هێشتا مەسەلەکە بەتەواوی چارەسەر نەکراوە. نازانین چۆن جیهانی دەرەکی کە لە زاتەوە دەرچووە، جارێکی تر لەگەڵ زاتدا یەک دەگرنەوە. هیگڵ لە ئاستی ئەم کێشەیەدا تا ڕادەیەک پشتگیریی شیلنگ دەکات، بەڵام

دیسانەوە ئەو ڕەخنە لە شیلنگ دەگرێت، چونکە ئەزموونی هونەری چارەسەری کێشە ئۆنتۆلۆجییەکان ناکات و هەروەها هونەریش لە فەلسەفەکەی هیگڵدا پلەیەک لە خوار ئایین و دوو پلەش لە خوار فەلسەفەوەیە.

شیلنگ و هیگڵ هاوڕێ بوون. نێوانیان ئەو کاتە شێوا کە پەرتووکی (فینۆمینۆلۆجی هۆش) لە ساڵی ١٨٠٦دا کەوتە بازاڕەوە و هیگڵ لە پێشەکیی ئەم پەرتووکەدا ڕەخنە لە بیروباوەڕی شیلنگ دەگرێت و بە پێچەوانەی ئەوەوە لەو باوەڕەدایە کە ناکۆکییەکان (Contradictions) هەرگیز تەفروتوونا نابن و لەناو زاتی ڕەهادا بەشاراوەیی دەمێننەوە. خۆ ئەگەر ناکۆکییەکان لەناو بچن و نەمێنن ـ وەکوو شیلنگ باسی دەکات ـ ئەوا زاتی ڕەها وەکوو ئەو شەوە تاریکەی لێ دێت، کە هەموو مانگاکانیش تیایدا ڕەشن.[٢٠]





# هیگڵ و کانت

هیگڵ لەناو تەوژمی بیروباوەڕ و فەلسەفەی ئایدیالیستی ئەڵماندا شوێنێکی تایبەتی هەیە. زۆر زانا و نووسەر هەن باوەڕ بە گرنگیی هیگڵ ناکەن و لە ڕۆڵی کەم دەکەنەوە. کارڵ پۆپەر لەم ڕووەوە دەڵێت: "ئەوەی هیگڵ باسی دەکات نویێ نییە و زانایانی پێش ئەو باسیان کردووە."[٢١] هەروەها شیڵنگ بڕوای بە ڕەسەنێتیی فەلسەفەی هیگڵ نەبووە، خۆی بە خاوەنی شەرعی داناوە. بە ڕای (ڕۆبرت سۆلۆمۆن)یش هیگڵ زۆر شتی لە هۆڵدەرلینی هۆنەرەوە وەرگرتووە.[٢٢] بە ڕای من، ئەم ڕەخنانە تاکو ڕادەیەک ناڕەوان و هیچ مافێکیان بە هیگڵ نەداوە. بەتایبەتی ڕەخنەکەی کارڵ پۆپەر نازانستییانەیە و لەڕاستییەوە دوورە و لە زۆر شوێنی پەرتووکەکەیدا لەسەر هیگڵ، ئەم زانایە، نەشارەزایانە پەلاماری هیگڵی داوە. ڕای (برتراند ڕەسڵ)یش وەنەبێت لە ڕاکەی پۆپەر کەمتر بێت و ئەمیش سیستەمی دیالیکتیک بە نافەلسەفییانە دادەنێت.

ئاشکرایە و کەس حاشا لەو ڕاستییە ناکات، کە مێژووی فەلسەفە زنجیرەیەکی نەپچڕاوە و هەموو فێرگەیەکی نوێ لە مناڵدانی فێرگەیەکی کۆن، یان لە خۆی پێشتردا، لە دایک دەبێت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە فێرگە نوێیەکە نوسخەی کتومتی فێرگە کۆنەکەیە و هیچی تازەی لەگەڵ خۆیدا نەهێناوەتە کایەوە. ئەمڕۆ، نەک بە تەنیا هیگڵ، بەڵکو هیچ فەیلەسووفێک شک نابەین سوودی لە بیروباوەڕەکانی فەیلەسووفەکانی پێش خۆی وەرنەگرتبێت. بێگومان گەلێک فەیلەسووف وەکوو هیراکلیدس، ئەفلاتون، ئەریستۆ، دیکارت، کانت، شیڵنگ و سپێنوزا کاریان کردۆتە سەر هیگڵ، لە هەمان

کاتیشدا هیگڵ توانیویەتی بیروباوەڕی نوێ دابهێنێت و سیستەمێکی نوێمان بۆ ئامادە بکات.

چارەسەرکردنی کێشە نارێکانی فەلسەفەکەی کانت لە لایەن زانایانی پاش (کانت)ەوە، نەبووە جێی ڕەزامەندی و دڵخۆشکەر بۆ هیگڵ. ئەم لەو بڕوایەدا بوو کە کێشەکە پێویستی بە سیستەمێکی نوێ و گشتگرانە هەیە، کە هەموو لایەنەکانی بوون بگرێتەوە. بەڵام ئایا ئەو سیستەمە چۆن دادەمەزرێت؟ تۆ بڵێیت مێشکی هیگڵ گەیشتبێتە ئەو ڕادەیەی بەرنامەیەکی گشتگر و ڕەها (مطلق)مان بۆ دابمەزرێنێت؟

هیگڵ لەو باوەڕەدایە کە دامەزراندنی سیستەمێکی ڕەها کارێکی ئەوەندە سەخت نییە، چونکە ئەو سیستەمەکە ناهێنێتە کایەوە و، ئەو سیستەمە خۆی هەیە و سیستەمی واقعە. یان وەکوو هیگڵ دەڵێت: "سیستەمێکە بوونی ڕەها (خوا) دایناوە و هیگڵیش تەفسیری دەکات.

لێرەدا سیستەمەکەی هیگڵ لە دوو ڕووەوە گشتگر و ڕەهایە:

١- لەبەر ئەوەی داهێنەرەکەی (بوونی ڕەها) ڕەهایە، ئەوا سیستەمەکەش دەبێت ڕەها بێت.

٢- سیستەمێکە کە هەموو لایەنەکانی بوون دەگرێتەوە.

ئەو سیستەمەی هیگڵ باسی دەکات، مەوزوعیيانە و ئۆنتۆلۆجیانەیە. هەروەها تەفسیر کراوە و هیگڵ هیچی نەخستۆتە سەر، یان هیچی لێ کەم ناکاتەوە. بەم شێوەیە سیستەمی کاتیگۆرییەکان کە لای کانت زاتین و لەناو هۆشی مرۆڤدان، بۆ هیگڵ ـ وەکوو فۆرمە لە ماتەربەدەرەکانی جیهانی بەرزی ئەفلاتون ـ مەوزوعین و خاوەنی بوونی ڕاستەقینەی خۆیانن. بە پێچەوانەی پارمەندیس و ئەفلاتون، هیگڵ بوونی ڕەهای بە ڕاستەقینەیەکی نەگۆڕ و وەستاو دانەناوە، بەڵکو ئەم جۆرە بوونە هەمیشە لە جووڵان و





گۆڕاندایە. ئەم خاڵەش بۆ ئەفلاتون و ئەریستۆ و دیکارت و سپێنۆزا سەیر و نەگونجاوە. لە دیدی ئەم زانایانەوە، بوونی ڕەها پڕ و تەواوە و گۆڕانکاری تیادا ڕوو نادات. ئەفلاتون هەموو فۆرمە ئایدیاڵەکانی جیهانی بەرز بە نەگۆڕ دادەنێت. گەیشتن بەم ئاکامەش وابەستە بە خەسڵەتەکانی ئەو فۆرمانەوە، کە لە سەروو هەموویانەوە ئەوەیە کە ئەمان لە ماتەر بەدەرن. هەر بوونەوەرێکیش لە ماتەر بەدەر بوو، ئەوا لەناو کات و شوێندا نییە و گۆڕانکارییش کاری تێ ناکات. بێگومان، ئەمەش بەئاکامگەیشتنێکی لوجیکمەندانەیە، کەچی هیگڵ باسی گۆڕانکاری و نەشونمامان بۆ دەکات، وەکوو بڵێت کە بوونی ڕەها لەبەر ئەوەی ناتەواوە و نەگەیشتۆتە پلەی تەواوکۆیی، پێویستی بە گۆڕانکاری و نەشونما هەیە. بوونی ڕەها، لەناو فەلسەفەی دیالێکتیکی هیگڵدا، وەکوو بوونی مرۆڤ دینامیکییە و بە هۆی پرۆژەکانییەوە هەوڵی خۆتەواوکردن و گەیشتن بە تەواوکۆیی دەدات. ئەم کارەش، یان گۆڕانکارییەکانی ناو بوونی ڕەها، دیالیکتیکییە. لەسەرەتاوە خۆی وەکوو سروشت (بوونێکی ماتەری و لە هۆش بەدەر) پیشان دەدات، ئەوجا خۆشی لە ئاستی سروشتدا وەکوو دژێک ڕادەوەستێت و لە ڕێگای ناکۆکییەکانی نێوان ئەم و سروشتەوە، بوونی ڕەها، خۆی دەگەیەنێتە قۆناغێکی دیالێکتیکی پێشکەوتووتر و لەگەڵ سروشتدا یەک دەگرێت و ژیانی بوونەوەرەکان دەهێنێتە وجودەوە.

بەکورتییەکەی، سیستەمی هیگڵ سیستەمێکی ڕەهایە، چونکە بوونی ڕەها و چالاکییەکانی دەخوێنێتەوە. بوونی ڕەهاش لەناو خەو و ئەندێشەی ئێمەدا پەیدا نەبووە و بوونێکی سەربەخۆ و ئۆنتۆلۆجییانەی هەیە. لەبەر ئەوەی ئەم سیستەمە ڕەهایە، ئەوا ئێمە ناتوانین هیچی نوێی بخەینە سەر، یان لێ کەم بکەینەوە. ئەوەی هیگڵ





یان ئێمە لەبارەیەوە دەزانین، تەنیا وەسفکردنی بوونی ڕەها یان فینۆمینۆلۆجییە.[٢٤]

گۆڕانکارییەکانی ناو بوونی ڕەها، وەکوو باسمان کرد، میکانیکی نین و دیالێکتیکین. زۆرانبازی و ململانێی هێزە ناکۆکەکان دەیانخولقێنن. پێش ئەوەی باسی چۆنیەتیی گۆڕانکاریی دیالێکتیکی بکەین، با کەمێک لە ئاستی ڕای (ئەلەکسەندەر کۆجیڤ)دا ڕاوەستین و چاوێک بە سیستەمەکەی (هیگڵ)دا بخشێنین. لە دیدی (کۆجێڤ)ەوە سیستەمەکەی هیگڵ وەکوو وێنەیەکی فۆتۆگرافی، واقعی دەرەوەمان پیشان دەدات و توانا و بڕستی داهێنانی نییە.[٢٥] کۆچێڤ ئەو خاڵەی فەرامۆش کردووە کە چۆن هیگڵ بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە ڕوانیویەتە گۆڕانکارییەکان و بە هۆی دۆزینەوەی هێزی نێگەتیڤ و ناکۆکییەکانی نێوان دوو قۆناغ، ڕەوڕەوەی گۆڕانکارییەکانی بەرەوپێش خستووە. دروستە، وەکوو چۆن لە (تەورات)دا نووسراوە: "هیچ شتێکی نوێ لە ژێر ڕۆشنایی خۆردا ڕوو نادات!"، ئاوهاش لە سیستەمی هیگڵدا هەر گۆڕانکارییەک دروست بێت، ئەوا لە ژێر چاودێریی بوونی ڕەهادا پەیدا دەبێت. کەچی هێشتا هیگڵ کۆڵی نەداوە و باسی سەربەستی و داهێنانمان بۆ دەکات.





# دیالێکتیک چییه؟

دیالێکتیک بەو سیستەمە ناسراوە، کە بێ ترس لە ئاستی ناکۆکییەکاندا ڕادەوەستێت و تەفسیری واقعێکی دینامیکی دەکات. دینامیکییەتی واقعیش لەسەر سیستەمی دیالێکتیکی، پێڕەوی جووڵان و گۆڕانکاریی سێکوچکەیی (Triad) دەکات. ئەم گۆڕانکارییەش لە بابەتەوە (Thesis) بۆ دژەبابەت (Antithesis) دەڕوات. بابەت و دژەبابەتیش لەبەر ناکۆکییەکانی نێوانیان لە ئەنجامی زۆرانبازی لەگەڵ یەکتردا قۆناغێکی نوێتر تێهەڵکێش (Systhesis) دەهێننە کایەوە. دژەبابەت لەناو مناڵدانی بابەتدا لە دایک دەبێت و بەشێکە لە ئەو، وەکوو دژی بابەتەکەش جودایە و خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەیە. بابەت و دژەبابەت لە قۆناغی سێیەمدا، کە ناومان نا تێهەڵکێش، یەک دەگرنەوە و قۆناغێکی دەوڵەمەندتر و پێشکەوتووتر دەخوڵقێنن. ئەم گۆڕانکارییە دیالێکتیکییەش هەمیشەییە و بەردەوامە.

زاراوەکانی (Thesis)، (Antithesis) و (Synthesis) بۆ یەکەم جار فیختە بە کاری هێناون. لە پێش (فیختە)شدا، کانت لە بەشی سێیەمی پەرتووکی یەکەمیدا (*Critique of Pure Reason*) ناوی بابەت و دژەبابەتی بردووە. لە دیدی (ئەرستۆ)شەوە (زینۆ)ی شاگردی پارمەنیدس داهێنەری دیالێکتیکە و بۆ یەکەم جار زینۆ دیالێکتیکانە بەرگری لە بیروباوەڕی پارمەنیدسی مامۆستای کردووە. پاش زینۆ، ئەفلاتون هونەری دیالێکتیکی پێش خستووە و لە دایەلۆگەکانیدا سوودی لێ وەرگرتووە.[٢٦] هەروەها ئەفلاتون لەو باوەڕەدا بوو، کە دیالێکتیک تاکەڕێگایەکی لۆجیکمەندانەیە کە ئێمە بتوانین لەوێوە، یان بە هۆی دیالێکتیکەوە، فۆرمە بەرز و نەگۆڕەکانی جیهانی لە ماتەر

بەدەر بدۆزینەوە.[٢٧] کانت، لەبەر ئەوەی زانینی گەڕاندۆتەوە سەر واقیعی بەردەستەکی و جگە لە تێگەیشتن (Understanding) هیچ توانایەکی باشتری ئەپستمۆلۆجی شک نەبردووە، دیالێکتیکی بە هەوڵدانێکی بێهوودە و کارێکی بێبەرهەم داناوە، کە مرۆڤی تووشی دەستەیەک بیروباوەڕی دووفاقی دژ بە یەکتر (Antinomies) کردووە.[٢٨] هیگڵ ڕاکانی ئەفلاتون و کانتی کۆ کردۆتەوە و لە یەکی داون. بڕوای وایە دیالێکتیک سیستەمێکی زانستانەیە و لە لایەکی تریشەوە سەرهەڵدانی ناکۆکی و لایەنە دژبەیەکترەکانی کردووە بە ڕەوڕەوی گۆڕانکاری. ئەگەر سەرنجێکی وردیش لە بۆچوونەکەی هیگڵ بدەین، دەبینین ناکۆکییەکانی بە دوو شێوە بینیوە:

یەکەم: ناکۆکییەکی جەوهەری (ناوەڕۆکی) کە لەناو بوونی هەموو بابەت و ڕووداوێکدا هەیە. هەر شتێک هەبێت، چی ماتەریال یان لە ماتەر بەدەر، ئەوا لەناو خۆیدا ناکۆکی هەڵگرتووە.

دووەم: ناکۆکی یەکێکە لە کاتیگۆرییەکان لەناو لۆجیکی هیگڵ و لە بەشی دووەمی لۆجیکدا سەر هەڵدەدات.

مەرج نییە لەناو دوو شتی جیاوازدا ناکۆکی هەبن. هەموو بابەتێک، لەناو خۆیدا، کۆمەڵێک ناکۆکی هەڵگرتووە. بۆ نموونە: سێو لە گوێز گەورەترە و لە کاڵەکیش بچووکترە. ئەمەش ناکۆکە، چونکە ئەگەر شتێک بچووک بێت ئەوا گەورە نییە و بە پێچەوانەشەوە دروستە. زانا ئایدیالیستەکانی پێش هیگڵ ـ جگە لە سپینۆزا ـ نەیانوێراوە خۆیان لە قەرەی ئەم کێشەیە بدەن و ناکۆکییان بە عەیبە و کەموکورت داناوە. هیگڵ بلیمەتانە سوودی لە کاتیگۆریی ناکۆکی وەرگرتووە و وەکوو ئەفلاتون هەوڵیداوە لەوێوە بگاتە ڕاستەقینەی بوون. لەمەش گرنگتر ئەوەیە، کە ناکۆکی بە تەنیا لەناو بابەتە بەردەستەکییەکان و بیروباوەڕی مرۆڤدا نییە، بەڵکو ناخی بوونی





ڕەهاشی پێکاوە. ئەوجـــا با بزانین بوونی ڕەها لە ئەنجـــامی سەرهەڵدانی ئەو ناکۆکییانەی ناو ناخی چۆن گۆڕانکارییەکانی تێدا ڕوو دەدات؟

بوونی ڕەها شتێکی بێهۆش و لە(گیان)بەدەر نییە. لەبەر ئەوەی هیچ بوونێکی تریش جگە لە بوونی خۆی لە ئارادا نییە، ئەوا بە تەنیا بیر لە خۆی دەکاتەوە. بەڵام هەموو بیرکردنەوەیەک ئاگاییە و ئاگاییش هەمیشە لە ئاستی بابەتێکدا ڕوو دەدات. لەکاتێکدا من لە ئاستی بوونی پەرتووکەکەی سەر مێزەکەم بە ئاگا دەبمەوە، ئەوا پەرتووکەکە دەبێت بە بابەتی ئاگابوونەوەکەم. ئەگەر پەرتووکەکە نەبووایە ئەوا ئەو ئاگاییەشم لەلا پەیدا نەدەبوو. ئاگایی و بابەتی ئاگایی پەیوەندییەکی دیالێکتیکیان هەیە و جیاوازن و لە یەکتریش جیا نابنەوە. بیرکردنەوە، بیرکردنەوەیە لە بابەتێکەوە. بەبێ بابەتی بیرکردنەوە، بیرکردنەوە نییە و ڕوو نادات. لەم حاڵەتەدا ئەگەر جگە لە بوونی ڕەها خۆی، هیچ بوونێکی تر نەبێت، ئەوا بابەتی بیرکردنەوە بۆ بوونی ڕەها دەبێت بە بوونی خۆی. واتە: بوونی ڕەها بیر لە بوونی خۆی دەکاتەوە. خۆی وەکوو هۆش، یان زات و خۆشی وەکوو بابەتی بیرکردنەوە لە یەکتر جیا نابنەوە، لە هەمان کاتیشدا وەکوو زات و بابەت دوو شتی جیاواز و ناکۆکن، چونکە زات بابەت نییە و بابەتیش زات نییە. باشترین نموونە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم دیاردەیە، بوونی مرۆڤ خۆیەتی. کاتێ (من) وەکوو زاتێک بیر لە بوونی خۆم دەکەمەوە، خۆم دەکەمە بابەتی بیرکردنەوەکەم. لەم جۆرە بیرکردنەوەیەدا، کە لە بیرکردنەوەم لەمەڕ پەرتووکی سەر مێزەکەوە جیاوازە، خۆم بیرکردنەوە و بابەتی بیرکردنەوەشم. دەبینین جیاوازیی (من) وەکوو بابەتی بیرکردنەوە لە خۆمەوە کە بیر دەکاتەوە، دوو شتی جیاواز و دوور و لەیەکتردابڕاو نین. بابەتەکە لە زاتەوە دەردەچێت و فۆرمێکی





دەرەکیی زاتە و ڕووی دووەمییەتی، کە بووە بە بێگانە و دژ بۆ زات. ئەم دوو لایەنە لەیەکترچووە و جیاوازە دەبنە بنچینە بۆ دیالێکتیکی بوونی ڕەها و گۆڕانکارییەکانی ناو بوونی، کە لێرەوە دەتوانین بڵێین: هەموو جۆرە خود ــ ئاگاییەک، بیرکردنەوەیەکی دیالێکتیکانەیە.

دوو لایەنە دژوارەکان (بابەت و دژەبابەت)، بەگوێرەی یاسای دیالێکتیک، لە یەکتر جیاوازن و جیاوازیش نین. ئەمەش خاڵێکە کە لە لۆجیکی ئەریستۆدا جێگای بۆ دانەنراوە. لە دیدی ئەرستۆوە لایەنە دژوارەکان، جگە لە پەیوەندیی دژایەتی و جیاوازیان لە یەکتر، پەیوەندیی تریان لەنێواندا نییە. لەبەر ئەم هۆیەشە ڕێچکەی دووالیستی بوو بە شاسیستەمی ناو فەلسەفەکەی ئەریستۆ. لەم ڕووانگەیەوە، ئەم زانایە گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە مادام (خوا) بوونەوەرێکی هۆشەکییە و لەماتەربەدەرە، ئەوا بە سەرچاوەی بوونی ماتەر دانانرێت. هیگڵ، پێڕەوی لۆجیکی ئەریستۆی نەکردووە و سیستەمێکی لۆجیکیی نوێی (دیالێکتیک) دامەزراندووە و هەوڵیداوە دژەکان لەناو ئەم سیستەمە نوێیەدا تێهەڵکێش بکات. خۆ ئەگەر هۆش و ماتەر دوو شتی جیاواز و دژوار بن، ئەوا زۆر بەئاسانی دەبن بە سەرچاوە بۆ بوونی یەکتر و هەردووکیان لەناو (Synthesis)دا یەک دەگرن.

با بزانین هۆش و ماتەر لە سیستەمی دیالێکتیکدا چۆن دژوار و نادژواریشن.

لەپێشەوە باس کرا، کە خود ــ ئاگایی (کاتێک من بیر لە خۆم دەکەمەوە)، خود دەکات بە دوو پارچەوە: خود و بابەتی خود، یان بیرکردنەوە و بابەتی بیرکردنەوە. بوونی ڕەهاش کە هۆشەکییە و خاوەنی بیرکردنەوەیە، لە پێش ئەوەی هیچ شتێک لە بووندا هەبووبێت، ئەو هەبووە و بەئاگا بووە. بەڵام ئایا بیری لە چی





کـردۆتەوە؟ وەکـوو وتمـان: بیـری لە خـۆی کـردۆتەوە. خـۆی بـووە بە بوونەوەرێکی بیرکـەر و بیرلێکراویش. ئەمـەش دوو لایەنی دژوار ئاماژە دەکـات. بـوونەوەری بیــرکــەر (Subject) لە بـوونەوەری بیــرلێکراوەوە (Object) لۆجیکانە و ئەپستمۆلۆجییانەش جیاوازن. ئەمە سـەرەتای لەدایکبوونی بوونە دژوارەکان و ناکۆکییە. ئەگەر دوو شت جیاواز بن، ئەوا ناگـونجێت یەک بن، یان ئەگـەر یەک شت بوون، ئـەوا ناگـونجـێت جیـاواز بن. لەبەر ئەم هۆکارە، ناکۆکییـەکان هـانمان دەدەن کە خـۆمان بگەیەنینـە قۆناغـێکی بەرزتر و لە شـوێنێکدا خـۆمـان ڕابگرین، کە ئەم ناکـۆکییـە یەخـەمـان نەگرێت. قـۆناغـە دیالێکتیکییـەکان بـەم جـۆرە گۆڕانیان تێدا ڕوو دەدات.

بابەتی بیـرلێکراو بۆ بوونـی ڕەهـا، یان هۆشـی ڕەهـا کە لە بنەڕەتدا بوونی ڕەها خـۆیەتی و لێـی جیا بۆتەوە و خـەسڵـەتی جیـاوازی لەگەڵ خـۆیدا هەڵگرتووە، دەبێت بە سـروشت یان جـیـهـانی مـاتەریال.[٢٩] ئـەگــــەر بـەراوردێک لـەنـێـــوان ئـەم دوو بـابـەتـە دژوارەدا بـکـەین و خـەسڵـەتەکانیان هەڵسەنگێنین، ئەوا ئـاشکراتر کێشـەکەمـان لا ڕوون دەبێتەوە. بۆ نموونە: بابەت، یـان بوونەوەری بیرکەرەوە (هۆشـی ڕەهـا) ئاگامـەندە و ژیاوە، ئەوجا مادام بابەتی بیـرلێکراو دژی هۆشی ڕەهـایە و لەگـەڵیدا ناکـۆکە، ئەوا دەبێت ئـەم بوونەوەرە، بێ گـیـان و بێ هـۆش بێت. هـەر شـتـێکیش بێ گـیـان و بێ هـۆش بێت، ئـەوا مـاتـەرە. لێـرەدا مـــــاتـەر لە هـۆشـی ڕەهـاوە دەرچـووە و لـێـی جـــیــــا بـۆتـەوە. ئـەم جیـابوونەوەیە، لەلای هۆشـی ڕەهـا، هـەسـتـکردنێکی قـووڵە بە نـامـۆیی (نـامــۆکــردنی بـابەتی بیــرکــردنەوە لـە هۆشــەوە.) ئـەمــەش نـامــۆیی مـیـتـافـیـزیکییـە کـە لە سـەرەتای جـوولان دیالێکتیکی هـۆشـی ڕەهـادا تووشـی ئـەم بوونەوەرە دەبێت. هـۆشی ڕەهـا، لـەئاکـامـدا، هـەوڵ دەدات بەسـەر نامـۆییدا سـەر بکەوێت و بەم نیـازەوە جارێکی تر لەگەڵ بابەتە





دژوارەکـــەیدا یـەک دەگـــرنـەوە. یەکگـرتنـەوەی ئـەم دوو بـابـەتـە دژوارە کارێکی مەحاڵ نییە، چونکە بابەتی دژ (ماتەر یان بابەتی بیرلێکراو) هـۆشی ڕەهـا خـــۆیەتی، بـەڵام لە فـــۆرم و شـــێـــوازێکی تردا. ئـەم یەکگرتنـەوەیە یان تێـهـەڵکێشـانـی (Synthesis) هـۆش و مـاتـەر، ژیان بە بابەتی بیـرلێکراو دەبەخشـێت و لـە ئەنجـامـی گـۆڕانکارییـەکان بوونی مـرۆڤیش دەهێنێتـە کایەوە. ئەو هـێزەی گـۆڕانکارییـەکان لە ئـەنجامی ناکـۆکییـەکانـدا پـەیدا دەکات، ڕەتدانەوە و نێگەتیـڤییـە کـە دەبێتـە سـەرچاوەی بوون. هەمـــوو گـــۆڕانـکارییـــەک ڕەتدانەوەی واقـــعـــێکی وەسـتـاوە و دامـەزراندنی واقـعـێکی نوێتـرە، کـە لـەو واقـعـە وەسـتـاوە لەپێشتر و باشترە.

فـێـرگە فەلسـەفییـەکان، دوای هیگڵ، سـوودێکی هـەرەمـەزنیـان لەم بۆچوونە و کاتیگۆریی ڕەتدانەوە وەرگرتووە. بەتایبەتی کارڵ مارکس و سـارتـەر و زانـایـانی سـەر بە فـێـرگـەی فـرانکفـۆرت، وەکوو مـارکۆز و ئـەدۆرنۆ و ڕەتـدانەوە لـەلایان بـووە بە هـێــز و بڕســـتـی بیـــروبـاوەڕی فەلسـەفییانە و گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوو.[٣٠]

هەرچەنـدە کـاتیـگۆریی تێـهـەڵکێش، بەتـایبـەتـی تێـهـەڵکێشـکردنی هۆش و مـــاتـەر، لـە زۆر لایەنـەوە لە ڕاڕەوی یـەکـبـــوونی (Pantheism) (ســـپـــینـۆزا)مـــان (١٦٣٢-١٦٧٧) نـزیک دەکـــاتەوە، بـەڵام با ئـەوە فـەرامـۆش نەکـەین کـە هیگڵ باوەڕی بە ڕاڕەوی یەکـبـوونـی نەبووە و ڕەخنەشـی لە سپێنۆزا گرتووە.[٣١] دروسـتـە کە ئەم وەکوو سپینۆزا و ئیبن عـەرەبی خـوا و سـروشـتی لە یەکتر جیا نەکردۆتەوە، بەڵام وەکو ئەوانیش خـوا بە بوونەوەرێکی تەواوکـۆیی و نەگـۆڕ دانانێت. هـۆشی ڕەها، کە سـەرچاوەی سروشتە، لە گۆڕان و پەرەسـەندندایە و دەیەوێت بگاتە پلەی تەواوکۆیی و بەسەر نامۆییدا زاڵ بێت.

بە تێکڕا سیستەمی هیگڵ دەکرێت بە سێ بەشەوە:





یەکەم: (لۆجیک) لە هۆشی ڕەها دەدوێت، پێش ئەوەی خۆی وەکوو سروشت دەربخات و لەگەڵیشیدا یەک بگرێتەوە. ئەو کاتیگۆرییانە ڕیز دەکات کە دەبن بە بنەڕەت و سەرچاوەیەکی تیۆری بۆ بوون.

دووەم: (سروشت) یان جیهانی ماتەریال، کە هۆشی ڕەها وەکوو دژ بۆ خۆی خووڵقاندوویەتی.

سێیەم: (هۆش) یان (فەلسەفەی هۆش) تێهەڵکێشی بەشی یەکەم و دووەمە. باسی کۆمەڵ و فەلسەفەی ڕامیاریی هیگڵ دەکات.

بەم گوێرەیە، لۆجیک زەمینەیەکی ئۆنتۆلۆجییانەیە بۆ سروشت و کۆمەڵ و مێژوو. ئەو یاسایانەمان دەداتێ کە گۆڕانکارییەکان پێڕەویان دەکەن. ئەگەر گۆڕانکارییەک پێڕەوی یاساکانی ئەم لۆجیکە نەکات، ئەوا زانستییانە ناناسرێت.

بێگومان، لێرەدا هیگڵ زیادەڕۆیی کردووە. ئەوەتا لە شوێنێکی تردا لەسەر مێژوو ڕاکەی خۆی ڕەت دەکاتەوە. لە لایەکەوە دەڵێت کە یاساکانی دیالێکتیک هەموو گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوو گەمارۆ دەدەن و هیچ شتێک لە بووندا بەبێ دیالێکتیک نییە، چونکە ئەم سیستەمە ڕەهایە. لە لایەکی تریشەوە دەڵێت کە وڵاتانی هیند و چین لەم گۆڕانکارییە دیالێکتیکییە بەدەرن.(٣٢)





## دیالێکتیکی زات و بابەت

پەیوەندییەکانی نێوان زات و بابەتی زات لەناو هەموو فێرگەیەکی فەلسەفیدا، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، باسکراون. زۆرجار ئەم پەیوەندییانە بە پەیوەندییەکی ئەپستمۆلۆجییانە دانراون و زانین بووە بە تاکەپردێکی نێوان زات و بابەت. بۆ نموونە: دێکارت، زانین بە تاکەپەیوەندی و ڕێگایەکی هەرسەرەکیش دادەنێت. زۆر فەیلەسووفی تریش هەن مەسەلەکە لەلایان بووە بە کێشەیەکی ئۆنتۆلۆجی و لێکۆڵینەوە ئەپستمۆلۆجییەکەش بووە بە پاشکۆی ئەو. لە فەلسەفەی کلاسیکیی ئەڵماندا، کانت یەکێکە لەوانەی لە ڕووانگەیەکی ئەپستمۆلۆجییەوە ئاماژەی کێشەکەی کردووە و زات و بابەتی بە دوو دوورگەی جیاواز داناوە. لەم حاڵەتەدا پەیوەندییەکانی نێوانیشیان کە وابەستن بە زانینەوە، دەبن بە دەرەکی (External) چونکە زات و بابەت وەکوو دێکارت دەڵێت: دوو ناوەڕۆکی لە یەک نەچوون و خەسڵەتی دیاریکراو و تایبەتی خۆیانیان هەیە. زات بیرکەرە (*Res cogitans*) و بابەتیش لەناو کات و شوێندایە (*Res extensa*). سەرەڕای ئەمەش، هەروەکوو پێشتر باسمان کرد، کانت زاتی لەناو قەوارەیەکی تەسکدا خەفە کردووە و توانا و بڕستی زانینی کەم کردۆتەوە. بەگوێرەی ئەوەی کە هەستکردنەکان توانای زات مەحکوم دەکەن، ئەوا زات هەرگیز ناتوانێت خۆی بگەیەنێتە ئەودیو دیواری ئەستووری جیهانی فینۆمینە و بەردەستەکی. بێگومان، ئەم سەرەنجامە کانتییە نەرێ و سلبییە و هێزی داهێنانی زات و دەستەڵاتی زانین تا ڕادەیەکی ئەوتۆ دابین دەکات. خۆ ئەگەر پەیوەندییەکانی نێوان زات و جیهانی دەرەوەی زات ئەپستمۆلۆجییانە بن و ئەو زانینەی زاتیش کەمتوانا و

کورتنەفەس بێت، ئەوا جیهانی دەرەوە یان ئەو ڕاستەقینەیەی لە دەرەوەی زاتدا هەیە و لەودیو فینۆمینەوەیە هەمیشە بە نەناسراوی و شاراوە دەمێنێتەوە. با بزانین هیگڵ چۆن چارەسەری ئەم کێشەیە دەکات؟ چۆن خۆی لە ژێر کارتێکردنی فەلسەفەی دووالیستیی کانت ڕزگار دەکات؟

هیگڵ لە پەرتووکی فینۆمینۆلۆجی هۆشدا (١٨٠٧) هەوڵیداوە پەیوەندییەکی نوێ لەنێوان زات و بابەتی دەرەوەدا دابمەزرێنێت، تاکو لەو ڕێگایەوە بتوانێت دیوارەکانی نێوانیان برووخێنێت و بەیەکتریان بگەیەنێت. بەتێکرا، چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە لەم ڕووانگە دیالێکتیکییەوە بە سێ جۆر لێک دەدرێتەوە:

١- یەکچاوگەی ئۆنتۆلۆجی.
٢- یەکچاوگەی لۆجیکی.
٣- یەکچاوگەی ئەپستمۆلۆجی.

١- یەکچاوگەی ئۆنتۆلۆجی

لە دیدی (هیگڵ)ەوە هۆشی ڕەها (The Absolute Spirit) ڕاستەقینەیەکی تاک و تەنیایە و بوونەوەرەکانی تر شێواز و فۆرمی ئەون. جیهانی دەرەکی (ماتەریاڵ) هەرچەندە لە هۆشەوە جیاواز و ناماقووڵە، بەڵام لە بنەڕەتدا شێواز و ڕووخساری هۆشی ڕەهایە. وەکوو شێوازێکی دەرەکی هۆش لە هۆشەوە دوور و جیاواز نییە. هۆش و جیهانی دەرەکی دوو دیوی یەک ڕاستەقینەنە. لەبەر ئەم هۆیە هۆش سەربەستە، چونکە بابەتی بیرکردنەوەی یان جیهانی دەرەکی ئەو بەشێکە لە بوونی خۆی. کاتێک هۆش یان زات بابەتی دەرەکی دەناسێت، ئەوا خۆی دەناسێت و کە ئەو بابەتەش دەگۆڕێت، ئەوا خۆی دەگۆڕێت.[٣٣]





٢- یەکچاوگی لۆجیکی

وەکوو باسمان کرد، لۆجیکی هیگڵ دیالێکتیکییە. دیالێکتیکیش جووڵانێکی هەرگیز نەوەستاوە و بەرەو پەرەسەندن و پێشکەوتن دەڕوات. ئەم پەرەسەندنەش لەسەر سێکوچکەی بابەت و دژی بابەت و تێکەڵکێش دەکەوێتە ڕێ. لە سیستەمی مەزنی دیالێکتیکدا هۆشی ڕەها بابەتە و جیهانی دەرەکی (ماتەریاڵ) کە بێگیان و ناماقووڵە دژی بابەتە و جیهانی ئۆرگانیکی زیندووش کە مرۆڤی تیادا بەشدارە تێکەڵکێشی هەردووکیانە. بابەت و دژەبابەت لەم لۆجیکەدا بە دوو جۆر، یان بە دوو شێوە، پەیوەندییان لەگەڵ یەکتردا هەیە. لە لایەکەوە جیاوازن و لە لایەکی تریشەوە جیاواز نین. بابەت (هۆش) دژەبابەت (ماتەریاڵ) نییە و لە هەمان کاتیشدا ماتەریاڵ فۆرمی دەرەکی هۆشە و لە هۆشەوە پەیدا بووە و لەگەڵیدا یەکە.

٣- یەکچاوگی ئەپستمۆلۆجی

ئەم لایەنە بەشێکی زۆری پەرتووکی فینۆمینۆلۆجیی هۆشی داگیرکردووە. هیگڵ لەسەرەتاوە وەکوو زانایەکی هەستەکی قۆڵی لێ هەڵکردووە و وەکوو ئەفلاتون و دێکارت زانیارییە هەستەکییەکان ڕەت ناکاتەوە. لەم قۆناغە سەرەتاییەدا، کە بە (Sense Certainty) ناوبراوە، زات یان هۆش ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ بابەتەکەی دەرەوەیدا هەیە. بابەتەکەش شتێکی مەوزوعییە و هەڵوێستی زاتیش لە ئاستیدا ڕەسەنترین و ڕاسترین هەڵوێستە،[٣٤] چونکە هیچ دیوارێکی لەنێوانیاندا نییە. لە هەمان کاتیشدا هەژارترین شێوەی زانینە، چونکە زات نەگەیشتۆتە ئەو قۆناغەی لە بابەتەکە بدوێت و بە هۆی زمانەوە خەسڵەتە هەمەکییەکانی ڕوون بکاتەوە.[٣٥] ئەم شێوە زانینە لەو زانینە ڕاستەوخۆیە دەچێت کە برتراند ڕەسڵ باسی کردووە.[٣٦]

بەڵام هیگڵ و ڕەسڵ ئاسمان و ڕێسمانیان بەینە و هیگڵ بەم جۆرە زانینە ڕازی نابێت و بڕواشی بە تاکڕەوی و سەربەخۆیی بابەتەکانی دەرەوەی زات نییە. ئەوجا ئەگەر بمانەوێت زیاتر لەبارەی ئەم بابەتەوە فێر بین، پێویستمان بە بەکارهێنانی زمان هەیە. بۆ نموونە: من دەڕوانمە بابەتێک لە ژوورەکەمدا و ڕاستەوخۆ بە هۆی ئەزموونی هەستکردنەوە دەیناسم، بەڵام ئەگەر یەکێک ئەو پرسیارەم لێ بکات کە من هەست بە چی دەکەم، لەوەڵامدا کۆمەڵێک خەسڵەتی ئەو بابەتە بە هۆی زمانەوە دەخەمە ڕوو کە لە ڕێگایانەوە بابەتەکە دەناسرێت. لە دیدی (هیگڵ)ەوە، زمان ڕۆڵێکی سەرەکی بۆ دامەزراندنی زانین هەیە و "ئەوەی باسی نەکرێت، نادروست و ناماقووڵە..."[٣٧] ئەوەی لە زمانیشدا بە کار دێت، زاراوەکانە یان کۆمەڵێ بیری هەمەکین (Universals) بەسەر هەموو شتێکدا ساغ دەبنەوە. بۆ نموونە، دەڵێین: "درەخت سەوزە." وشەی (درەخت) و (سەوز) دوو بیری هەمەکین. (درەخت) بۆ هەموو جۆرە درەختێک، گەورە یان بچووک، درەختی سێو یان بەڕوو، بە کار دێت. هەروەها وشەی (سەوز) وەسفی هەموو بابەتێکی سەوز دەکات.

لەم قۆناغە سەرەتاییەدا ئێمە ئەوەندە دەزانین کە بابەتەکە لە بەردەمماندا قووت بۆتەوە و شتێکە کە هەیە. وشەی (هەیە) لە زمانی ئینگلیزیدا (is) بۆ هەموو شتێکی هەبوو دادەنرێت و سێ جۆر ماناشی هەیە کە لێرەدا پێویست ناکات لەسەری بدوێین، بەڵام بیرێکی هەمەکییە. ئەوجا با ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەین، کە ئایا ئەو بابەتە چییە؟ لەوانەیە هێشتا نەمانەوێت کە خەسڵەتەکانی بخەینە بەرچاو، بەڵام ئەوەندە دەزانین کە (ئێستا) بابەتەکە (لێرە)دایە. دەبینین ناسینی ئەو بابەتە تاکە، وابەستە بەم بیرە هەمەکییانەوە. بیرە هەمەکییەکانیش وەکوو بیرەکانی ناو جیهانی گیانەکی ئەفلاتون لەم

بوونە دابین نەکراون و زەمینەیەکەی کۆنکرێتیان هەیە. بابەتە تاکەکان و بیرە هەمەکییەکان پەیوەندییەکی دیالێکتیکییان هەیە و بەبێ یەکتر نابن. ئەمەش لە بۆچوونەکانی ئەریستۆوە نزیکە.[٣٨]

لەبەر هەژاریی زانین لەم قۆناغە سەرەتاییەدا، زات پەنا دەباتە بەر قۆناغێکی بەرزتر و دەوڵەمەندتر. ئەم قۆناغە نوێیەش، هەرچەندە لە قۆناغی پێشووتر بەرزترە و توانای شیکردنەوەی بابەتەکەی هەیە و لەبەر ڕۆشنایی زمانیشدا خەسڵەتەکانی ئاماژە دەکات هێشتا لە ژێر دەستەڵاتی هەستکردن و ئەزموونی هەستەکیدایە، کە هیگڵ پێی دەڵێت: (Perception). زات لەم قۆناغەدا کەشفی خەسڵەتە هەستەکییەکان وەکوو ڕەنگ و بۆن و تام و شێوازی بابەتەکە دەکات و ئەو پرسیارە لە خۆی دەکات، کە ئایا ئەو بابەتەی لە بەردەممدا قووت بۆتەوە چییە؟ ئەوجا با بڵێین: "ئەوە مێزە." ئەوجا دەپرسین: "مێز چییە؟" لەوەڵامدا: "مێز، شتێکی قاوەیی و ڕەق و شێوە لاکێشەییە و لە تەختە دروست کراوە و چوار قاچی هەیە و بۆ خوێندنەوە و نووسین بە کار دێت." ئەم کۆمەڵە خەسڵەتانەی خراونەتە پاڵ ئەم بابەتە و بابەتەکەی پێ ناسراوە، هەستەکی و هەمەکین. هەستەکین، چونکە بە هۆی هەستکردنەوە ناسراون و هەمەکیشن (Universal)، چونکە ئەم خەسڵەتانە بە تەنیا بەم مێزەوە نەبەستراون، زۆر بابەتی تر هەن، کە قاوەیی و ڕەقن و شێوەی لاکێشەیان هەیە. لێرەدا مێزەکە بابەتێکی بەردەستەکیی تاک و هەندەکییە (Particular) و خەسڵەتەکانیشی فرە و هەمەکین. ئەمەش لەخۆیدا ناکۆکە. ئەگەر بابەتێک تاک بێت، ئەوا نابێت فرە بێت و ئەگەر هەندەکیش بێت، ئەوا هەمەکی نییە، بەڵام لە لۆجیکی هیگڵدا ئەم کێشەیە، یان ئەم ناکۆکییە، وەکوو قۆناغێکی دیاریکراو جێگای خۆی کردۆتەوە و بەبێ ترس هیگڵ باسی کردووە. ئەوەی گرنگە ڕێگادۆزینەوەیە بۆ خۆڕزگارکردن لەم ناکۆکییە. ئەمەش

تەنیا بە گۆڕانی دیالێکتیکی چارەسەر دەکرێت و لەم ناکۆکییە لەنێوان هەندەکی و هەمەکیەتیی بابەتی هەستەکییەوە خۆمان دەگەیەنینە قۆناغێکی بەرزتر بە ناوی تێگەیشتن (Understanding).[٣٩] تێگەیشتن ئاوڕ لە خەسڵەتە هەستەکییەکان ناداتەوە و بە شوێن خەسڵەتی تری بابەتەکەدا وێڵە. بە شێوەیەک لە بابەتەکە دەگات، کە ئەو بابەتە دوو دیوی هەیە: ناوەڕۆک و ڕوواڵەتی، یان دیوی دەرەکی و ناوەکی، کە کانت لە تۆژینەوە ئەپستمۆلۆجییەکەیدا لە پەرتووکی یەکەمیدا ئاماژەی بۆ کردووە. لە دیدی (کانت)ەوە، تێگەیشتن دوو قۆناغی زانینە و لەپاش ئەم هیچ هێزێکی زانینی تر لەناو هۆشی مرۆڤدا نییە. هیگڵ لەگەڵ کانتدا هاوڕا نییە و تێگەیشتن بە دواقۆناغی زانین دانانێت و وەکوو قۆناغی پێشووتریش لە ناکۆکی بەدەر نییە. هەستکردن لە ئاستی هەندەکێتی و هەمەکێتیی بابەتەکەدا تووشی ناکۆکی بوو، تێگەیشتن لە ئاستی ناوەڕۆک و ڕووخساری دەرەکیی بابەتەکەدا تووشی ناکۆکی دەبێت. بەو شێوەیە بابەتەکەمان پێ دەناسێنێت، کە بابەتێکی دەرەکییە و ڕووخساری هەیە و فینۆمینەیە، لە هەمان کاتیشدا لەو باوەڕەدایە کە ئەو بابەتە، یان ڕاستەقینەی ئەو بابەتە، لایەنی ناوەوەیەتی (ناوەڕۆک) نەک ڕووخساری. لەم قۆناغەدا زات بە شوێن خەسڵەتی هەستەکیدا ناگەڕێت، بەڵکو هەوڵ دەدات کۆمەڵێ خەسڵەتی هەمەکی بدۆزێتەوە، کە پەیوەندییان بە هەستکردنەوە نییە. بۆ نموونە: ئەو خەسڵەتانە وەکوو (یەک، زۆر، هێز، وزە، ڕاکێشان)، کە زیاتر بوون بە زاراوە بۆ زمانی زانستی فیزیک، دەدۆزرێنەوە. لەبەر ئەمەشە هیگڵ بەم قۆناغە دەڵێت: "دەستەلاتداری یاساکان"، چونکە هەریەکێک لەم خەسڵەتە هەمەکییانە بوون بە یاسایەکی زانستییانە لە سروشتدا. هیز، بۆ نموونە، خەسڵەتێکە کە هەستکردن ناتوانێت بیدۆزێتەوە، یان هیچ

ئەزمـوونێکی هـەسـتـەکی (ڕاکـێشـان)ی پـێ نەناسـیـوین. هـێـزیش لە کـاتێکدا دەناسـرێت، کـە خـۆی دەربخـات. خـۆدەرخـسـتنی هێـز (Expression) و هـێـز لەم قـۆناغـەدا وەکـوو دوو شـتـی جـیـاواز خـۆیان پـیـشـان دەدەن، بەڵام بەگـوێرەی یاسـای دیالێکتـیکی جـیـاواز نین و دەچنەوە نـاو یەک.[٤٠] تۆژینەوەی بڕست و تـوانا و نـاکـۆکـیـیـەکـانی قـۆنـاغـی تێگەیشـتن لای هیگڵ، پەلامـاردان و ڕەخنەگـرتنە لە ئەپستمۆلۆجیی کانت. بەڵگەکانی لە ژێر ناوی (هێز و خۆدەرخستنی هێز)، (جیهانی هەڵەوگەڕاو) و (میتافۆری پەردە) ڕەتدانەوەی جیهانی نومینەی نەناسراوی کانتە.[٤١] ئەم بڕوایەکی بەهێزی بەوە هەیە، کە ناکۆکییەکانی قۆناغی تێگەیشتن وەکوو ناکۆکییەکانی قۆناغی پێشوو بە ڕێ بخـرێت و زات لـەوێوە خـۆی بگەیەنێـتـە قـۆناغـێکی بەرزتر و دەوڵەمەندتر کە زیاتر لە ڕاستەقینەوە نزیک بێت. ئەم قۆناغە نوێیەش (هۆش)ە، یان زانینی هۆشـەکییە، کە هێز و خـۆدەرخستنی هێزەکە، ناوەڕۆک و ڕووخسار، دیوی ناوەوە و دەرەوە لە یەکتر جیا ناکاتەوە و بە یـەک ڕاسـتــەقـینەیان دادەنێت. لەم قـۆنـاغـەدا زات دەگـاتە ئەو قـەناعـەتەی کـە ئەوەی هەیە بەشـێکە لە بوونی ئەو و هیچ شـتـێک لە دەرەوەی ئەو بوونـەیدا نـیـیـە و هـیـچ بابەتێک بـەو بێگانە نـیـیـە. ڕۆبرت سـۆلـۆمـۆن لەم بارەیەوە دەڵێت: "کە زات لەم قۆنـاغە دیالێکتیکییـەدا خۆی دەگەیەنێتە ڕاستەقینەی فەلسەفە مۆنستییەکەی فیختە."[٤٢]

دیالێکتـیکی زات و بابەت، وەکـوو هـێـز گـۆڕانکاری و ڕەتدانەوە، لایەنی تیـۆریی زات ئـامـاژ دەکـات، کـە یاریدەی زات دەدات بە هۆی نـاسـینی (زانین) بابەتەکـەوە، بابەتەکە بگـۆڕێت و بیکات بە (بیر) یان بەشـێک لە بوونی خـۆی. لایەنی تیـۆری بەبێ لایەنی پراکـتـیک یان کارکردن (Labour) ناتەواوە و زات ناتوانێت بە تیۆری، بەبێ پراکتیک، بابـەتەکـە بەتـەواوی بگۆڕێت و بیکات بە مـوڵکی خـۆی. بۆیە هیگڵ





بەمەشەوە نەوەستاوە و تیۆری و پراکتیکی بە دوو لایەنی تەواوکەر داناوە و لە دیالێکتیکی زات و بابەتەوە دەپەڕێتەوە بۆ دیالێکتیکی کارکردن (Dialectic of Labour) و زانین دەکات بە هێزی گۆڕانکاری و زاتیش رۆڵێکی پراکتیکی بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت. لەگەڵ سەرهەڵدانی رۆڵی پراکتیکی زاتدا کێشە کۆمەڵایەتی و رامیارییەکانیش لە مێژوودا سەر هەڵدەدەن و هەموو هەوڵ و تێکۆشانێکی زاتیش هەیە، ئەوا لە پێناوی گەیشتن بە سەربەستی و سەلماندنی ئەو سەربەستییەدایە ئەم بەشەی فەلسەفەکەی هیگڵ کارێکی مەزنی کردۆتە سەر فێرگەکانی پاش خۆی، بەتایبەتی فێرگەی مارکسیزم و بوونخوازی. کارل مارکس، مارتن هایدیگر و ژان پۆڵ سارتەر سوودیان لە کێشە کۆمەلایەتی و رامیارییەکانی هیگڵ وەرگرتووە. پێش ئەوەی ئەم کێهشەیە بە قووڵی روون بکەینەوە با بزانین هیگڵ چۆن لە کۆمەڵ و مێژوو دەگات. هیگڵ لە پەرتووکی (فەلسەفەی مێژوو)دا دەڵێت: "کە مێژووی جیهان پێشکەوتنی هۆشە بەرەو سەلماندن و وەدەستهێنانی سەربەستی. سەربەستی، دوائامانجی زاتە و زاتیش بە بەردەوامی ـ بەبێ پاشگەزبوونەوە ـ بەرەو گەیشتن بەو سەربەستییەی دەڕوات، خەبات و تێکۆشانی ناو مێژوو بۆ ئەم مەبەستەیە."

پەرتووکی فەلسەفەی مێژوو (*The Philosophy of History*) چوار بەشی هەیە: جیهانی رۆژهەلات، جیهانی یۆنان، جیهانی رۆم و جیهانی ئەڵمان. دانانی جیهانی رۆژهەلات لەسەرەتادا و جیهانی ئەڵمان لە پاش هەموویانەوە، مەبەست و جێگای دیاریکراوی خۆی هەیە. جیهانی رۆژهەلات و ولاتان و شارستانیەتیی چین و هیند و فارس دەگرێتەوە. شارستانییەتی چین و هیند بە وەستاو و نەگۆڕ دانراون، کە گۆڕانکاریی دیالێکتیکییان تێدا روو نادات و لەبەر ئەم هۆیەش ئەم دوو شارستانیەتە دەکەونە دەرەوەی بازنەی مێژووی

جیهانەوە و بەشێک لە گۆڕانکاریی مێژووی جیهانی نین.[٤٣] بەگوێرەی هیگڵ و ئەنجامێکی لۆجیکمەندانەش دەگەینە ئەو باوەڕەی کە شارستانیەتیی ڕۆژهەڵات، بە حوکمی ئەوەی یاسای دیالێکتیکی بەسەردا ساغ نابێتەوە و ئەوجا لە دەرەوەی بازنەی مێژووی جیهاندایە،[٤٤] ئەوا بەرەوپێشەوە ناڕوات و کۆمەڵگاکەش وەکوو ئاوی ناو گۆمێکی وەستاو بۆگەن دەبێت و لێی ناخورێتەوە. بێگومان، ئەم ئەنجامە نەڕێیە لەگەڵ ئەو بیروباوەڕەی هیگڵدا، کە گوایە سیستەمی دیالێکتیکی هەمەکی و گشتگرە ناکۆکە. ئەگەر ئەم سیستەمە گشتگر بێت، ئەی چۆن شارستانیەتیی ڕۆژهەڵات ناگرێتەوە؟ هیگڵ لەو خاڵەوە گەیشتووە بەم ئەنجامە نەڕێیە، کە گوایە کۆمەڵگای ڕۆژهەڵات باوەڕی بە سەربەستیی تەنیا کەسێک هەیە، ئەویش پاشا یان فەرمانبەرە کە دەستەڵاتێکی ڕەهای هەیە و کۆمەڵی لە سەربەستی بێبەش کردووە. کۆمەڵگای ڕۆژهەڵات ملکەچ و سەرشۆڕی فیرعەون و پاشا و میرەکانە و بیری سەربەستی لەلایان پەیدا نەبووە. بە شێوەیەکی ئاشکراتر دەتوانین بڵێین کە مرۆڤی ڕۆژهەڵات نامۆیە، خاوەنی ئیرادەی خۆی نییە و داگیرکراوە، یان وەکوو مارتن هایدیگر و سارتەر دەڵێن: بوونێکی نارەسەنی هەیە و ناوەڕۆکی خۆی دۆڕاندووە. مرۆڤێکیش خاوەنی خۆی نەبێت و نامۆ بێت، ئەوا خاوەنی مێژووش نابێت، چونکە مێژوو گۆڕانکاری و داهێنانە. مرۆڤێکیش سەربەست نەبێت، ئەوا ناتوانێت گۆڕانکاری و داهێنانی هەبێت. چۆنیەتیی داگیرکردنی ئیرادەی کۆمەڵ، بە ڕای هیگڵ، لەلایەن دەستەڵاتی فەرمانبەرانەوە هێندە گرانە دەنگی کۆمەڵی خنکاندووە و مرۆڤ ڕێگای پێ نەدراوە بە سەربەستی بژی. بۆ نموونە: لە (چین)دا فەرمانڕەوایی و دەستەڵاتی دەوڵەت لەسەر خێزان و خوێن ڕاوەستاوە. لە (هیند)دا بەستراوە بە بۆچوونێکی ئایینی و میتافیزیکییەوە و کۆمەڵ کراوە بە چوار بەشەوە،

کە کەس توانای ئەوەی نەبێت گۆڕانکارییان تێدا دروست بکات، چونکە بەگوێرەی ئایینی هیندی مرۆڤ هەرچییەک بێت، فەرمانبەر، یان (شودراس – ڕەنجبەر)[٤٥] ئەوا لە چارەی نووسراوە و خۆی بڕستی گۆڕان و هەڵبژاردنی ئەو حاڵەتە بەسەرداسەپێنراوەی نییە. هیگڵ، بە چاوێکی تر دەڕوانێتە وڵاتی فارس، هەرچەندە ڕژێمی پادشایی فارسەکان بە ڕواڵەت ڕژێمێکە کە تاکەفەرمانبەرێک (پاشا) خاوەنی دەسەتەڵاتی ڕەهایە و حوکم بەسەر کۆمەڵدا دەکات و بە تەنیا ئەویش مافی سەربەستی هەیە، بەڵام هێشتا ئەم ڕژێمە لە ڕژێمی پاشاگەریی چینییەکان و هیندییەکان جیاوازە.[٤٦] لە دیدی (هیگڵ)ەوە شارستانییەتی فارس کە لەسەر بیروباوەڕەکانی زەردەشت وەستاوە، باوەڕی بە هێزی ڕووناکی هەیە، کە هەموو جیهانی داگیر کردبێت و دژی هێزی تاریکیش لە جەنگدایە. ئەم بیروباوەڕە ئایینیە باوەڕێکی تەواوی بە یەکسانی هەیە و کۆمەڵی بەسەر چین و دەستەکاندا وەکوو فەلسەفەی هیندی، یان ئەفلاتونییەت، دابەش نەکردووە و پاشاگەردانیش نابەستێتەوە بە خێزانێکەوە. بەگوێرەی ئەوەی کە هێزی ڕووناکی سەرپەرشتیی جیهان و کۆمەڵ دەکات، ئەوا جۆرێک یاسا هەیە، کە دەوڵەت و کۆمەڵیش بەڕێوەبەرێت. لەبەر ئەمە شارستانیەتیی فارس، بە پێچەوانەی شارستانییەتی چین و هیندەوە، بنەمایەکی میتافیزیکیی نەگۆڕی نییە و مێژووش لێرەوە – واتە: لە شارستانیەتیی فارسەوە – دەکەوێتە ڕێ و دەست پێ دەکات.[٤٧]

تۆوی سەربەستی لە زەمینەی شارستانیەتیی فارسدا هەیە، واتە ئەو شارستانیەتە توانای گۆڕانکاری تێدایە، بەڵام هێشتا باسەکەمان لێرەدا تەواو نابێت و شارستانیەتیی باشتر و پێشکەوتووتریشمان هەیە کە لە پێش شارستانیەتیی فارسدا گۆڕانکارییان تێدا ڕوودوە و لەناو بازنەی مێژووی جیهاندان و یاساکانی دیالێکتیکیان بەسەردا

چەسپاوە. ئەمەش بە سەرکەوتنی شارستانیەتیی یۆنان بەسەر فارسدا دەست پێ دەکات. ئەم سەرکەوتنە واتای ئەوەمان پێ دەبەخشێت کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە ژێر دەستی حوکمی پاشاگەردانی ڕزگاری بووە و چۆتە ناو قۆناغێکی تازەترەوە فۆرمی (دەوڵەتانی ـ شاری) یۆنانی وەرگرتووە و ئەو بیر و باوەڕەش لە دایک بووە کە بە تەنیا فەرمانبەر سەربەست نییە و گەلێک لە کەسانی تریش لەناو کۆمەڵدا سەربەستن، یان هاونیشتمانی ئەو دەوڵەتە ـ شارییە سەربەستن. سەربەستیی مرۆڤ لەم قۆناغەشدا بەتەواوی دانی پێدا نەنراوە. یۆنانییەکان لە چینییەکان و هیندییەکان و فارسەکان پێشکەوتووتر بوون و باوەڕیان بە سەربەستیی هاونیشتمانییەکانیان کردووە، بەڵام هێشتا خۆیان لە ئاستی ئەوانەدا کوێر کردووە کە نەیانتوانیوە وەکوو ئەرستۆکراتێک، یان دەوڵەمەندێک، ببن بە هاونیشتمانییەکی شاری (ئەسین) و سەربەست بن یان دەستگای کۆیلایەتی وەکوو خۆی لە شارستانیەتیی کۆنی یۆناندا مایەوە و گۆڕانکاری تێدا پەیدا نەبوو، تەنانەت فەیلەسووفێکی وەکوو ئەریستۆش باوەڕی بەم دەستگایە هەیە و پشتگیریی نایەکسانی و چەوساندنەوەی مرۆڤی لاواز دەگرێت.(٤٨)

شارستانیەتیی ڕۆمانی لە شارستانیەتیی یۆنانی پێشکەوتووترە، چونکە لای ڕۆمانییەکان دەوڵەت خاوەنی دەستوورێکی ڕامیارییە و باوەڕی بە مافی سەربەستیی تاکەکانیش هەیە. ئەم بڕوانامەیەش ناکۆکی لەنێوان دەستەڵاتی دەوڵەت و یاخیبوونی تاکەکاندا پەیدا دەکات و تاکەکان دەتوانن بەرانبەر دەستەڵاتێکی زۆرلێکەر ڕاوەستن. ئەمەش لە دیدی (هیگڵ)ەوە هۆکارێکی سەرەکییە بۆ سەرهەڵدانی چەند فێرگەیەکی فەلسەفی وەکوو ڕواقییەکان و ئەپیقۆرییەکان و گومانکاری، ئەوجا لە پاشاندا سەرهەڵدانی ئایینی مەسیحایەتی لەناو

ڕۆمـانیـیـەکـان و لە سـەردەمی (کـۆنسـتنتین) بوو بە ئاییـنی دەوڵەت. ڕۆمانییەکان نەیانتوانی مەسیحایەتی بەرەوپێشەوە بەرن، چونکە ئەم ئایینەیان کـرد بە سـەرخـان و لەسـەر ژێرخـانی کـۆن و لەناوچووی شـارسـتـانیـەتیی خـۆیان دایانمەزراند کـە بووە هۆی وەسـتـانی بیروباوەڕی مەسیحایەتی لەناو بازنەی دۆگمای کەنیسەدا. ئەم ئایینە پێـویسـتی بە کـۆمـەڵگایەکی دیالێکتـیکی هەبوو کـە لەناو گـۆمـە چەقیوەکەدا ڕزگاری بکات و بڕوانامەی سەربەستیش لەگەڵ خۆیدا بەرز بکاتەوە. لە دیدی (هیگڵ)ەوە ئەم کـۆمـەڵگایە لە ئەڵمـانەوە سـەریهەڵداوە، "جیـهـانی ئەڵمـانی کـولتـوور و ئایینی ڕۆمـانی بەرەو تەواوکۆیی برد."(٤٩)

گەیشتن بەم قۆناغەی کە سەربەستیی مرۆڤمان بۆ مسۆگەر دەکات ئاسـان نییـە و زات دەبێت هەوڵ و تەقـەلای بۆ بدات. مسـۆگـەرکردی سـەربەسـتیش لەم هەوڵ و تەقەلایەدا لەو حاڵەتەدا ڕوو دەدات کە زات بتـوانێت دیوارەکـانی جیـاوازی لەنێوان خـۆی و جیـهـانی دەرەوەیدا بڕوخـێنێت و خـۆی بکات بە خـاوەنی ڕاسـتـەقـینەی جیـهـان. هەتاکو جیـهان لە زاتەوە جیـاواز بێت و بێگانە بێت، ئەوا زات ناتوانێت لافی سـەربەسـتی و سـەرداری لێ بدات و خۆی بکات بە خـاوەنی جیـهان. لە دیدی (هیگڵ)ەوە، زات دەبێت لەمە زیاتر پشت بە زانین نەبەسـتێت و هەوڵ بدات بە ڕێگایەکی پراکتیکی جیهان بەلای خۆیدا بەرێت. لێرەدا (حـەز)لێکردن نەک زانین خـۆی دەکات بە هـێزێکی دیالێکـتیکی و زات بەرەو جیـهـان دەهێنێتـە جـوولان. زات، بۆ گـۆڕانی بابەتێک دەبێت لە پێـشــدا حـەزی لێ بکات، چونکە هـیچ مـرۆڤـێک نییـە بابەتێکی حـەزلێنەکـردوو بۆ خـۆی هەڵبـژێرێت و بیکات بە مـوڵکی خـۆی. حەزلێکردن (Desire) کە لێرەدا بووە بە هێزێکی دیالێکتیکی واژەیەکی فەلسەفییانەیە و واتایەکی فەلسەفییانەی گشتگری هەیە. هەروەها، لە





دیدی (هیگڵ)ەوە، ئەم واژەیە ڕۆڵێکی سەرەکی بۆ پەیداکردنی (خۆ ــ ئاگایی ــ Self-consciousness) هەیە و بە هۆی حەزەوە زات هەست بە بوونی خۆی دەکات و خۆی دەناسێت.[٥٠] کاتێ تینوومە و حەز لە ئاوخواردنەوە دەکەم، ئەم حەزە سێ شتم بۆ ڕوون دەکاتەوە:

یەکەم: من تینوومە.

دووەم: حەز لە ئاو دەکەم.

سێیەم: ئەو حەزە، حەزی منە.

(من) وەکوو زات لە ڕێگای حەزەوە دەرک بە بابەتەکە دەکەم و لە هەمان کاتیشدا وەکوو مرۆڤێکی تینوو هەست بە بوونی خۆم دەکەم. حەزەکەشم هانم دەدات بابەتەکەم دەست بکەوێت و بیکەم بەماڵی خۆم، یان بیکەم بە بەشێک لە بوونی خۆم و ڕەفزی بوونی سەربەخۆیی و (بەبێ من)ی بابەتەکە بکەم. کاتێک پەرداخێک ئاو دەخۆمەوە، ڕەفزی بوونی سەربەخۆیی ئاوەکە، وەکوو بابەتی حەزەکەم، دەکەم و کە ئاوەکەش دەخۆمەوە، ئەوا ئەو بابەتە حەزلێکراوە دەکەم بە بەشێک لە بوونی خۆم، یان دەیخەمە سەر بوونم. زات و بابەتی حەزلێکراو دەبن بە یەک و جیاوازییە دەرەکییەکانی نێوانیان ون دەبن. لەبەر ئەم هۆکارە، حەز دەبێت بە هێزێکی نێگەتیڤی (Negative) و لە دیالێکتیکی کارکردندا دەبێت بە سەرچاوەی گۆڕانکارییەکانی ناو زات و بابەتی حەزلێکراو. حەز، بە پێچەوانەی زانینەوە، ئارەزووی ناسینی بابەتەکە و پەیڤکردنی بۆ چەمک و خەسڵەتە هەمەکییەکانی نییە. قەناعەتی زات بۆ داگیرکردن و وەدەستهێنانی بابەتی حەزلێکراوی بە کردەوە دێتە ئاکام. ئەگەر حەزەکە، ئارەزوویەک بێت بۆ بابەتێکی ئامادەکراوی بەر دەست (وەکوو ئاوەکە)، ئەوا دەست بۆ پەرداخە ئاوەکەی سەر مێزەکەم درێژ دەکەم و دەیخۆمەوە. لەکاتێکدا، بابەتی حەزلێکراو ئامادە نەکراوبێت، با بڵێین حەزمان لە مێزێکە بۆ خوێندنەوە، ئەوا ئەو

بابەتە ــ هەرچەندە لە بازاڕیشدا بیکڕین ــ ئەوە بەرهەمی کارکردنی زاتە و لە ئەنجامی کارکردن و گۆڕانکاریی سروشتەوە پەیدا بووە. یەکێک هەبووە بچێتە دارستانەکە و درەختێک ببڕێتەوە و بۆ ئێمەی بکات بە مێز. یان کە پێڵاوێک لە بازاڕدا دەکڕم، ئەو پێڵاوە بەرهەمە و لەسەر دیالێکتیکی کارکردن ڕاوەستاوە. پێڵاو لە پێشدا لەو فۆرمەدا نەبووە، یەکێک هەبووە بچێتە بازاڕ چەرمەکەی بکڕێت و خۆشەی بکات و ڕەنگی بکات و بیفرۆشێت، ئەو کەسەش ئەو چەرمەی لە کەسێکی تر کڕیوە، کە گا و مانگایەکی زۆری هەیە و لە لادێیەکدا بۆ مەبەستی فرۆشتنی چەرمەکەی بەخێویان دەکات. نموونەی ئاوخواردنەوەکە لە نموونەی مێزەکە، یان پێڵاوەکە، جیاوازە. جیاوازییەکەشیان لەوەدایە کە نموونەی دووەم (بابەتی بەرهەمهێنان) کێشەیەکی ئاڵۆزترە و کاری زیاتری پێویستە. لەوانەشە لێرەدا ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەین کە جیاوازیی نێوان حەزی مرۆڤ و حەزی ئاژەڵ چییە؟ خۆ ئاژەڵیش خاوەنی حەزە و وەکوو ئێمە حەزی لە ئاوخواردنەوەیە.

ئاماژەکردنی جیاوازییەکانی نێوان حەزی مرۆڤ و حەزی ئاژەڵ کارێکی گران نییە. حەزی مرۆڤ هۆیەکە بۆ ئاگابوونەوە لە بوونی ــ خۆ، یان هەستکردنە بە بوونی زات. حەزکردنی ئاژەڵ زاتی ئاژەڵەکە ناخاتە ڕوو یان نابێت بە دافعێک بۆ خۆ ــ ناسین بۆ ئاژەڵەکە. پشیلەیەک لە کاتی تینوێتیدا ناڵێت مادام من تینووم، من هەم، یان ئەوەتا هەست بە بوونی خۆم دەکەم. هەروەها حەزی پشیلەکە توانای گۆڕانی بابەتە حەزلێکراوەکەی نییە. دروستە، ئەویش وەکوو من ئاوەکە (بە خواردنەوەی) دەخاتە سەر بوونی خۆی، بەڵام هەرگیز ناتوانێت لە کارخانەیەکدا پارچەچەرمێک بکات بە جووتێ پێڵاو یان مێزێکمان لە تەختە بۆ دروست بکات.





حـەزی مـرۆڤ هێـزی گـۆڕانی بوونـە بۆ ئەو بابەتانـەی حـەزیان لێ دەکات. بە هۆی حـەزەوە چەرمەکەی کرد بـە پێڵاو، درەختەکەی کرد بە مێز و تاشـەبەردێکیش دەکات بە پەیکەری پێشـمەرگەیەکی کوژراو. لە هەمووشـیان گرنگتر، ئەو جیاوازییـەیە کە ئاژەڵێک داوای بەڵگەنامەی بوونی لە ئاژەڵێکی تر ناکات و گوێ ناداتە ئەوەی ئاژەڵەکانی تر باوەڕ بە بـوونی دەکــەن، یـان نا. یان زۆر لـە ئاژەڵـەکــانی تر بکات بـاوەڕ بە بـەها و بیــــروبـاوەڕی ئەو بکـەن بەڵام مــــرۆڤ بۆ پـەیداکــــردنی ئـەم بەڵگەنامەیە خۆی دەخاتە ناو جەنگی مان و نەماوە.[٥١] مرۆڤ بە تەنیا حەز لە بابەتە بەردەستەکییەکان و بابەتە سروشتییەکان ناکات، بەڵکو حـەز لـە مـرۆڤـێکی تریش دەکـات. حـەز دەکـات کـەسـانی تر دان بە بوونیدا بنێن و بیروباوەڕ و بەهاکانی پەسەند بکەن. حەزی مرۆڤ، لەم ڕووەوە، لە حـەزی ئاژەڵ جـیـاوازترە. حـەزێکە کـە دەبێـتـە بنچـینەی شـارسـتـانییـەت و کـەلەپوور و ئەدەب و هونەر و زانست و دامـەزرانی دەستگا کۆمەڵایەتییەکان.

هیگڵ، لـە دیالێکتـیکی کـارکردندا واز لـە حـەزی ئاژەڵ دەهـێنێت و باسی حەزی مرۆڤمان بۆ دەکات. حەزی مرۆڤ، وابەستە بە نەبوونی و کـەمـوکـورتیـیــەکـانی ناو بـوونی ئەم بـوونەوەرە. زات، لەبـەر ئەوەی ناتـەواوە، ئەو نەبوونـی و کـەمـوکـورتیـیـەی بـە داگـیـرکـردنی بابـەتە بەردەسـتـەکـییـەکە پڕ نابێتـەوە. لێرەدا ناچار ڕوو دەکاتە بابـەتێکی دیکە، کە لە بابەتە بەردەستەکییەکانەوە جیاوازە و لە بوونی خـۆیەوە (زاتەوە) نزیکە. زات بـابەتێکی پێویسـتـە، یان حـەز لـە بابەتێک دەکات لە خۆی بچێت. وەدەستهێنان و داگیرکردنی ئەم جۆرە بابەتە (زاتێکی تر) بەبێ زۆرلێکردن و شـەڕ ڕوو نادات. لەم حاڵەتەدا وەکوو چۆن زات حـەز لە ئاو دەکات و دەیەوێت ئاوەکە بکات بە بەشـێک لە بوونی خـۆی، بە هـەمان شـێوەش دەیەوێت زاتەکەی بەرانبەری بکات بە مـوڵکی خۆی





ئەمەش لەوێدا دەستگیر دەبێت کە سەربەخۆیی زاتە حەزلێکراوەکە ڕەفز دەکات.

هیگڵ ئەم ڕووداوە بە کێشەیەکی ئۆنتۆلۆجی و هەربوو دادەنێت و وێنەیەکی تاریکی ژیانی کۆمەڵایەتیمان پیشان دەدات کە لەلای مارکسیستەکان و بوونخوازەکان بە چەوساندنەوەی چینایەتی و ڕوودانێکی مێژوویی، نەک ئۆنتۆلۆجی، دادەنرێت.

زاتی حەزکەر بەو نیازەی بوونی خۆی بسەلمێنێت و زاتە حەزلێکراوەکە باوەڕ بە بوونی بکات، زاتە حەزلێکراوەکە داگیر دەکات. ئەمەش لە پێناوی سەربەستی و سەلماندنی بەرزی و دروستی بەهاکانی خۆی بەو کارە هەڵدەستێت و نایەوێت هێزێکی دەرەکی (وەکوو زاتە حەزلێکراوەکە، یان کەسانی دیکە) حەز و ئارەزووەکانی ببەستنەوە. بوونی کەسانی دیکە وەکوو بوونی هێزێکی دەرەکی لە ئاستی ئەمدا دەبێتە هۆی پەرژینکردنی سنووری هێز و سەربەستیی ئەم زاتە. بەڵام ئایا زاتە حەزلێکەرەکە چۆن زاتە حەزلێکراوەکە داگیر دەکات و لەو هەڕەشەیە ڕزگار دەبێت؟ هەموو دەزانین کە زاتی حەزلێکراو وەکوو پەرداخە ئاوەکە نییە هێندە بەئاسانی داگیری بکەین و بیکەین بە موڵکی خۆمان. ئەویش وەکوو ئێمە خاوەنی هۆش و حەز و ئارەزووی خۆیەتی و دەیەوێت ئێمە داگیر بکات و حەزمان لێ دەکات.

داگیرکردنی زاتی حەزلێکراو هەردوو زاتەکە دەخاتە ناو جەنگی مان و نەمانەوە. پێویستە هەردوو زاتەکە ئاڵای جەنگیان هەڵکەن و بەرانبەر یەک بوەستن، بەڵام نابێت ئەم زاتانە هەوڵی کوشتنی یەکتر بدەن. مردنی یەکێک لەمان، کۆتایی بە حەزی داگیرکردن و سەلماندنی بوونی دەهێنێت. زاتەکان پێویستیان بە بوونی یەکترە نەک بە مردن. خۆ ئەگەر لە ئەنجامی ئەم شەڕ و زۆرانبازییەدا یەکێک لە زاتەکان





بمرێت، ئەوا زاتە زیندووەکە بەبێ گەواه دەمێنێتەوە و کەس نابێت بڕوانامەی بداتێ و باوەڕ بە سەربەستی و بەهاکانی بکات.

لەم جەنگەدا ئەو زاتەی زیاتر لە مردن دەترسێت حەز دەکات بە هەر شێوەیەک بێت بژی و نەکوژرێت. ئەوجا گرنگ نییە بۆ ئەو شێوەی ژیانی باش بێت یان خراپ، بە کۆیلەیی بژی یان سەربەست بێت. ترسی ئەو لە مردن غەریزەی مانەوە و ژیانی زیاتر دەکات و هێزی ئەژنۆی دەشکێنێت و خۆی تەسلیم دەکات. زاتەکەی تریش، لەبەر ئەوەی لە مردن ناترسێت، ئالای سەرکەوتن بەرز دەکاتەوە و سەربەستانە دەژی و دەبێت بە خاوەنی زاتەکەی دیکە. زاتی حەزلێکراو دەبێت بە کۆیلە و زاتی حەزلێکەریش بە خاوەنکۆیلە.

زۆرکەس لەگەڵ ئەم لایەنە سایکۆ ـ ئۆنتۆلۆجییەی هیگڵدا ڕێک ناکەون، یان ڕا و سەرنجی تایبەتی خۆیان هەیە. با واز لەم ڕایانە بهێنین و بزانین کۆیلە و خاوەنکۆیلە چۆن پێکەوە دەژین و چ گۆڕانکارییەکیان بەسەردا دێت؟

خاوەنکۆیلە (حەزلێکەر) دوای جەنگەکە دەبێت بە خاوەنی سروشت و بە خاوەنی زاتەکەی دیکەش (حەزلێکراو یان کۆیلەکە). کۆیلەکەش بە حوکمی ئەوەی تەسلیم بووە و (ترس لە مردن) بووە بە هۆکار بۆ دۆڕانی سەربەستییەکەی، ناتوانێت ببێت بە خاوەنی خۆی، لە ژێر دەسەڵاتی زاتەکەی تردا (خاوەن کۆیلە) کار دەکات و لەو ڕێگایەوە سروشت دەگۆڕێت بۆ ئەو بابەت و کاڵایانەی خاوەنەکەی حەزی لێ دەکات و پێویستی پێی هەیە. خاوەن کۆیلەکە پێویست ناکات بە کار هەڵسێت، ئەوەی دەیەوێت کۆیلەکە بۆی دەهێنێتە ئەنجام. خاوەنکۆیلە کار ناکات و خاوەنی هەموو شتێکە، کۆیلەکەش هەموو کارێک دەکات، بەڵام خاوەنی هیچ نییە.

ئەوەی سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشێت ئەوەیە، کە سەرەڕای دەستکەوتەکان و ژیانی فەنتازیی زاتە سەرکەوتووەکە یان





خاوەنکۆیلەکە، هیگڵ لەو باوەڕەدایە کە ئەم زاتە هەرچەندە خۆی بە سەربەست دادەنێت و خاوەنی هەموو شتێک بێت، هێشتا سەربەست نییە و ئەگەر لەو بڕوایەشدا بێت کە سەربەستە، ئەوا ئەو بڕوایەی بێ بناغە و نادروستە. هۆکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە:

یەکەم: بۆ ئەوەی زات سەربەست بێت، پێویستە لە لایەن زاتێکی سەربەستی وەکوو خۆیەوە بڕوا بەو سەربەستییەی بکرێت. بەڵام جەنگەکە یەکێک لە زاتەکان دەکات بە کۆیلە و کۆیلایەتیش خەسڵەتەکانی بوون بە مرۆڤ لە کۆیلە دەسەنێتەوە. خاوەنکۆیلە بە چاوێکی مرۆڤانە تەماشای کۆیلەکەی ناکات و بە مرۆڤی دانانێت. کۆیلە بۆ خاوەنکۆیلە وەکوو کەلوپەل و بابەتە بەردەستەکییەکانی ژیانی ڕۆژانەیە. لەبەر ئەمەشە کۆیلە وەکوو کەلوپەل لە بازاڕدا فرۆشراوە، یان هەر کاتێک خاوەنەکەی ویستوویەتی دراوە بە کەسێکی دیکە. ئەریستۆ، کە باوەڕی بە کۆیلایەتی هەیە و دژی نەوەستاوە، دەڵێت: "هەروەکوو چۆن هاوڕێیەتی لەنێوان وەستایەک و کەلوپەلەکانی بەردەستیدا دروست نابێت، ئاوهاش خاوەنکۆیلە ناتوانێت هاوڕێیەتی کۆیلەکەی بکات. کۆیلە بۆ خاوەنکۆیلە وەکوو کەلوپەلە بەردەستەکییەکانە بۆ وەستاکە."(٥٢) کەوابوو لە کۆتایی جەنگەکەدا خاوەنکۆیلە لە لایەن مرۆڤێکی دیکەوە، یان زاتێکی ئازادەوە، دان بە بوونی و ئازادییەکەیدا نەنراوە.

دووەم: خاوەنکۆیلە زاتێکی بێکار و تەمەڵە، لەناو دەریای حەز و ئارەزوو یان هیدۆنیستیدا دەژی. ئەم خاوەنی داهێنان و گۆڕانکارییەکان نییە، کۆیلەکە کاری بۆ دەکات و سروشتی بۆ دەگۆڕێت و ئەو کاڵایەی بە باڵا دەبڕێت کە خاوەنەکەی دەیەوێت. کۆیلە خاوەنی ڕاستەقینەی بەرهەمە. سەربەستی لە دیدی هیگڵەوە، توانا و بڕستی گۆڕانکاری و داهێنانە بۆیە دەتوانین بڵێین کە تۆوی ئازادی لە بوونی کۆیلەدایە نەک لەلای خاوەنەکەی.

سێیەم: خۆشی و ڕابواردنی خاوەنکۆیلە پابەندی کارکردن و بەرهەمی کارکردنی کۆیلەیە. ئەگەر کۆیلە لە کارکردن بوەستێت، ئەوا بەهەشتی خاوەن کۆیلە دەشێوێت. ئەو جیهانەی خاوەنکۆیلە بە موڵکی خۆی دەبینێت بە دەست و بازووی کۆیلە هەڵچنراوە و دیوارەکانی بەرز کراونەتەوە. دروستە زاتە سەرکەوتووەکە خۆی بە خاوەنی کۆیلە و بەرهەمی کۆیلە دادەنێت، بەڵام خاوەنی ڕاستەقینەی بەرهەم تەنیا کۆیلەیە. کەوابوو خاوەنکۆیلە لەبەر ئەوەی ژیانی بە بەرهەمی کۆیلەوە بەستراوە ناتوانێت خۆی بە ئازاد دابنێت.

چوارەم: لە ڕوویەکی تریشەوە، کە لێرەدا ناوی دەنێین وابەستەبوونی فۆرمەلیستی یان لۆجیکی، بوونی خاوەنکۆیلە بەستراوە بە بوونی کۆیلەوە. ئەگەر کۆیلە نەبێت، ئەوا خاوەنکۆیلەش نابێت.

خاوەنکۆیلە، یان زاتی حەزلێکەر، بە نیازی وەدەستهێنانی سەربەستی و داگیرکردنی زاتەکەی دیکە خۆی خستۆتە ناو هەڵەیەکی مێژووییەوە. مادام کۆیلە تەنیا هێزێکە جیهان دەگۆڕێت، کەواتە بەرهەمەکەی کە تەعبیرە لە زاتی، لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی جیهاندا، ئەو زاتەشی گۆڕانی بەسەردا دێت و بەرەوپێشەوە دەڕوات. ڕۆژێک کۆیلە ئەو ڕاستەقینەیەی لێ ئاشکرا دەبێت کە ئەو خۆی خاوەنی بەرهەم و سەربەستییە. لەم ئاگاهاتنەوەیەدا کۆیلە وەکوو زاتێک جارێکی تر دەبێت خۆی بخاتە ناو جەنگەوە و سەربەستییەکەی لە خاوەنەکەی وەربگرێتەوە. بەڵام مەرج نییە ئەم ئاگاهاتنەوەیە هەموو جارێک ببێتە بنچینەیەک بۆ شۆڕش و هەڵگیرسانی جەنگێکی نوێ. زۆرجار، کۆیلەکە ئەم ڕاستەقینەیە دەناسێت بەڵام هێشتا غەریزەی ژیان بەسەریدا زاڵە و لە مردن دەترسێت و ئامادەی هەڵگیرسانی ئاگری شۆڕش نییە.[٥٣] کۆیلەکە هەوڵ دەدات خۆی لەو لێپرسینەوە

مێژووییە بدزێتەوە و بە شوێن بیانوودا دەگەڕێت کە بیسەلمێنێت شۆڕش یان جەنگێکی نوێ لە پێناوی سەربەستیدا پێویست نییە، یان وەکوو بوونخوازەکان دەڵێن، کۆیلە خۆی هەڵدەخەڵەتێنێت و درۆ لەگەڵ خۆیدا دەکات، چونکە خەبات مەرجێکی سەرەکییە بۆ وەدەستهێنانی سەربەستی. ئەم خۆهەڵخەڵەتاندنە پەنابردنە بەر کۆمەڵێک ئایدیۆلۆجییە وەکوو بیروباوەڕی ڕواقیزم (Stoicism) و گومانکاری (Scepticism) و بیروباوەڕی ئایینی (Unhappy Consciousness) کە لە دیدی هیگڵەوە ئەمانە ئایدیۆلۆجیای کۆیلایەتین و مرۆڤ لە چەوساندنەوە ڕزگار ناکەن.

(ترس لە مردن) جارێکی تر هێز و توانای کۆیلە دەڕووخێنێت و ڕێگای نادات کۆت و زنجیری کۆیلایەتی بپچڕێنێت و دامودەستگای چەوسێنەر تەفروتونا بکات. لە هەمان کاتیشدا، لە ئەنجامی کارکردن و بەرهەمهێنانەوە، کۆیلەکە گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە زوڵمی لێکراوە و بەشی خوراوە و پێویستە مرۆڤ سەربەست بێت. لێرەدا، کۆیلە دەبێت هەڵوێستی خۆی دیاری بکات و یەکێک لەم ڕێگایانە (سەربەستی یان کۆیلایەتی) هەڵبژێرێت. بەڵام هێشتا ئامادەی جەنگە خوێناوییەکە نییە، چونکە لە مردن دەترسێت و غەریزەی ژیان بەسەریدا زاڵە. مرۆڤێک واقعیەتی مردن قبووڵ نەکات لە ئاستی ناخۆشیی ژیان و مردندا کەم توانا و کەم هێزە. بۆ ئەوەی لەم دوودڵییە ڕزگار بێت و خۆی لە لێپرسینەوەی جەنگەکە دەرباز بکات، ئەوا کۆیلە بوونی سەربەستی بە ڕاستەقینەیەکی دەرەکی و (مەوزوعی) دانانێت و دەیگەڕێنێتەوە بۆ (بیر) یان جیهانی ناوەوەی زات. مادام مرۆڤ لە جیهانی ناوەوەی بیرکردنەوەیدا سەربەستە، ئەگەر پا و دەستیشی کۆت و زنجیر بکرێت بیرکردنەوە و خەو و ئەندێشەی داگیر ناکرێت. هیچ هێزێک نییە ئەم سەربەستییەی لێ





زەوت بکات. ئەم هەڵوێست و شێوازی بیرکردنەوەیەش پێی دەوترێت (ڕەواقی) کە پەنابردنە بەر بیر و جیهانی ناوەوەی زاتە. ڕەواقییەکان دەستەیەک فەیلەسووفی یۆنانی بوون و سەر بە کولتووری هێلینین (Hellenic Culture)، پاش ئەریستۆ پەیدا بوون. زانایەک بە ناوی زینۆ (٣٣٦–٢٦٤ پێش زایین) پێشەوای ئەم دەستەیە بووە.[٥٥] ڕواقییەکان سەربەستی دەبەستنەوە بە بیرەوە و لە واقعی دەرەوەی زاتی دوور دەخەنەوە و تیۆری و پراکسیس (کارکردن) لە یەکتر جیا دەکەنەوە و بایەخ بە لایەنی یەکەمیان دەدەن و کارکردن فەرامۆش دەکەن. ئەوجا، بەگوێرەی ئەم زانایانە، مادام مرۆڤ لەناو زاتی خۆیدا، لە بیرکردنەوەدا بە ئەندێشە سەربەستە، کەواتە پێویست بە خەبات و تێکۆشان لە پێناوی سەربەستیی ناو مێژوو یان جیهانی دەرەوەدا ناکات. ئەوەی دروست و ڕەمانا بێت جیهانی ناوەوەی مرۆڤە. مرۆڤ ڕەش بێت یان سپی، ئاغا بێت یان ڕەنجبەر، ئەوا ئەو لەناو بیر و خەو و خەیاڵی خۆیدا سەربەستە.

ڕەفزکردنی ڕاستەقینەی جیهانی دەرەکیی زات لەلای ڕەواقییەکان لە ئەنجامی هەڵوێستێکی گومانکارییەوە پەیدا نەبووە. ئەمان باوەڕیان بە بوونی واقیع هەیە، بەڵام ڕاستەقینە دەگەڕێننەوە بۆ جیهانی ناوەوەی زات و واقیعی دەرەکی بە بێمانا دادەنێن و لە بەهاکەی کەم دەکەنەوە.

ئایدیۆلۆجیەتی ڕەواقی کە لە قۆناغێکی تایبەتیدا سەری هەڵداوە و ئایدیۆلۆجیەتی کۆیلایەتییە، ئەوا ئەمیش وەکوو هەموو قۆناغێکی ناو سیستەمی دیالێکتیک لە کەموکووڕی و ناکۆکی بێبەش نییە، بۆیە ڕەتکردنەوەی پێویستە و زات لەم قۆناغەش خۆی تێ دەپەڕێنێت و خۆی دەگەیەنێتە قۆناغێکی بەرزتر.[٥٦]

کەموکووڕیی ئایدیۆلۆجیی ڕەواقی لەوەدایە کە زات بێ ناوەڕۆکە و





خاوەنی بابەتی حەز و بیرکردنەوەی نییە. زات بەبێ بیرکردنەوە نییە و بیرکردنەوەش بەبێ بوونی بابەتی بیرلێکراو لە دەرەوەی زاتدا نابێت. لە دیدی هیگڵیشەوە، کۆیلە لە ئاستی ئەم کەموکووڕی و ناکۆکییە بەئاگایە، بۆیە بە نیازی خۆڕزگارکردن لەم ناکۆکییە پەنا دەباتە بەر جۆرێکی دیکەی ئایدیۆلۆجیا، وەکوو (گومانکاری).[٥٧] ئەگەر ڕەواقییەک باوەڕ بە ڕاستەقینەی جیهانی دەرەکی و مێژوو بکات، ئەوا دەبێت باوەڕ بە سەربەستیی دەرەکیش بکات. ئەوجا، لێرەدا، لەبەر ئەوەی کۆیلە ئامادەی جەنگەکە نییە و هێشتا دەیەوێت خۆی لەو لێپرسینەوەیە بدزێتەوە، ئەوا جارێکی تر پەنا دەباتە بەر جۆرێکی تر لە بیروباوەڕی فەلسەفییانە و ئایدیۆلۆجیایەکی نوێ دەهێنێتە کایەوە. گومانکاری خۆدوورخستنەوەیەکی بێپایانە لە لێپرسینەوەی مێژوو و یان خەبات و کارکردن بۆ سەربەستی. ئەم جۆرە ئایدیۆلۆجیایە بوونی واقیعی دەرەوە ناسەلمێنێت و بایەخی پێ نادات، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو واقیعە بە نەبوو دادەنێت و ڕەفزی دەکات.[٥٨] ڕەواقییەکان باوەڕیان بە بوونی واقیعی دەرەکی هەبوو، بەڵام بە بێبایەخ دایاننا. بەگومانەکان واقیعی دەرەکی بە بێبایەخ دانانێن، بەڵکو بەتێکڕا ڕەفزی دەکەن و باوەڕیان بە بوونی نییە. ئەم زانایانە، بۆ ئەوەی واقیعێک بۆ سەربەستی بخوڵقێنن و ناوەڕۆکێک بدەن بە زاتە بێ ناوەڕۆک و پووچەکەی ڕەواقییەکان، ئەوا بە جارێک ڕەفزی واقعیان کردووە و گومان لە بوونی هەموو شتێک دەکەن. سەرەڕای ئەم کارەشیان، بەگومانەکان، هاتوون و جیهانیان کردووە بە دوو بەشەوە، یەکەم: ئەو جیهانەی کە تیایدا دەژین و هەستی پێ دەکەین، دووەم: جیهانێک لەودیو ئەم جیهانە هەستپێکراوەوە، کە هەرگیز ناناسرێت و مرۆڤ ناتوانێت بیناسێت. ئەمەش کارێکی ناڕەوایە و لە کەموکووڕی و ناکۆکییەوە دوور نییە. هیگڵ، لەم ڕووەوە دەڵێت، کە بەگومانەکان لە





ئاستی ئەم هەڵوێستەیاندا، لە ئاستی جیهانی دووەمدا، درۆ لەگەڵ خۆیان دەکەن. چۆن دەتوانین بڵێین کە جیهانی نەزانراو یان نەناسراو هەیە، لە کاتێکدا کە هیچ زانیارییەکمان لەبارەیەوە نییە. ئایا ئەم جۆرە بۆچوونە جۆرێک زانیاری لەبارەی ئەو جیهانەوە نادات بە ئێمە؟ یان ئەگەر ئێمە هیچی لەبارەوە نەزانین، چۆن دەتوانین بڵێین هەیە؟ ئەم نەزانینە، شێوەیەکی زانینە. کاتێک مرۆڤ دەڵێت: جیهانێکی نەناسراو هەیە یان ڕاستەقینەی ئەودیو جیهانی هەستەکی نەزانراوە، ئەوا ئەو زانیارییەمان پێ ڕادەگەیەنێت کە ئەو جیهانە (هەیە) و (نەزانراوە). باشە ئەگەر جیهانێک نەزانراو بێت، چۆن دەتوانین بڕوا بە بوونی بکەین؟

سەرەڕای ئەم ناکۆکییەش، ڕاڕەوی گومانکاری، بە دابەشکردنی جیهان بۆ دوو شێوە، هەستەکی و ناهەستەکی، ماتەریاڵ و ناماتەریاڵ، نزم و بەرز زەمینەی بۆ ئایدیۆلۆجیەتی لە خۆی پێشکەوتووتر خۆش دەکات، کە هیگڵ ناوی دەنێت ئایین. لەم قۆناغەشدا کۆیلە ئامادە نییە خۆی فڕێ بداتە ناو جەنگە خوێناوییەکەوە. لە هەمان کاتیشدا وازی لە ڕەواقییەت و گومانکاری هێناوە. بەگوێرەی ئایدیۆلۆجیای سێیەم (ئایین)، مادام جیهانێکی تر لەودو جیهانی هەستەکییەوە هەیە کە لە ماتەر بەدەرە و بەرزە و پاکە ئەوا جیهانێکە کە مرۆڤ وەکوو خاوەنکۆیلە ناتوانێت مرۆڤێکی دی وەکوو کۆیلەی تێدا بچەوسێنێتەوە، چونکە هێزێکی مەزنتر لە هێزی مرۆڤ خاوەنی ئەو جیهانەیە و فەرمانڕەوایی دەکات. لەبەر ئەمە ژیانی کورتنەفەسی ناو جیهانی هەستەکی بێمانا و بێبایەخە و نابێت مرۆڤ لە پێناوی خۆشی و حەزی ناو جیهانی هەستەکیدا خۆی بخاتە ناو هەلاکەتەوە. ئەگەر مرۆڤ کۆیلە بێت یان خاوەنکۆیلە، ڕەش یان سپی، ئاغا یان ڕەنجبەر دەبێت بمرێت و ژیانی کورتە و کۆتایی پێ دێت.





ژیانی ناو جیهانی بەرز جاوێدانی و هەمیشەییە. هەموو کەسێک لە ئاستی هێزە بەرزەکەدا (خوا) لەو جیهانە ئەبەدییەدا یەکسانە و ئاغا و ڕەنجبەر، کۆیلە و خاوەنکۆیلە، وەکوو یەک تەماشا دەکرێن. لە دیدی هیگڵەوە، ئەم ئایدیۆلۆجیایە مرۆڤ لە ئاستی گۆڕانە مێژووییەکاندا ئیفلیج دەکات چونکە بەڵێنی ژیانێکی سەربەست و بەختەوەرانەی لەناو جیهانێکی دیکەدا دەداتێ.

کۆیلە لە دواجاردا، لە سەردەمی سەرهەڵدانی کۆمەڵگای نوێدا، توانی بەسەر ناکۆکییەکانی ئەم قۆناغە و ئەم ئایدیۆلۆجیایەدا زاڵ بێت و خۆی لە داوی (ترس) ڕزگار کرد و خۆی خستە ناو جەنگێکی خوێناوییەوە، کە بە شۆڕشی بورجوازی فەرەنسا دادەنرێت و دامودەستگای کۆیلایەتی ڕوخا و خاوەنکۆیلە باوەڕی بە سەربەستیی کۆیلە هێنا و کۆیلەش لە ژێر ئەو بارودۆخە نامۆیە ڕزگاری بوو. هیگڵ، شۆڕشی بورجوازی فەرەنسا بە دواقۆناغی گەشەکردن و پێشکەوتنی مێژوو دادەنێت و لەگەڵ ئەم قۆناغەدا، لە دیدی ئەمەوە، کۆمەڵ گەیشتۆتە ئاستێک کە واقیع بە (تەواو)ی بناسێت و زانیارییەکی (تەواو)ی لەبارەوە هەبێت و کۆتاییش بە مێژوو دێت.





# نامۆیی

پەیوەندیی نێوان زات و بابەتی زات بەلای مەسەلەیەکی گرنگتردا (نامۆیی ـ Alienation) رامان دەکێشێت. نامۆیی لەلای هیگڵ، بە پێچەوانەی مارکس و سارتەر و تەنانەت هایدیگریشەوە، رووداوێک نییە بارودۆخی ژیانی کۆمەڵایەتی سەپاندوویەتی، بەڵکو حاڵەتێکی زەرورییە و بنەمایەکی میتافیزیکی هەیە و دەبێت زات تەجروبەی بکات یان وەکوو قۆناغێک پیایدا تێپەڕێت. بەبێ نامۆیی و هەستکردن بە نامۆیی و خۆڕزگارکردن لە دەستی نامۆیی زات پێش ناکەوێت و ناتوانێت بەرەو قۆناغەکانی داهاتووی یان دیالێکتیکیانە هەنگاو بنێت. ئەوجا گرنگ نییە، ئەگەر ئێمە ئەم رووداوەمان ناو نا میتافیزیکی یان ئۆنتۆلۆجی، ئەوا زات هەر دەبێت تووشی بێت و ئازایانەش خۆی لە قەرەی بدات. لە رووپەکی ترەوە هیگڵ نامۆیی و خوڵقاندن و بابەتێتی (Objectification) لە یەک جیا نەکردۆتەوە. بۆ نموونە: (گۆرنیکا) وەکوو تابلۆیەکی هونەری بابەت و بەرهەمی زاتی پیکاسۆی هونەرمەندە و لە زاتی پیکاسۆوە دەرچووە و لێی جیا بۆتەوە. ئەم جیابوونەوەیە، لە دیدی هیگڵەوە، نامۆیی هونەرمەندەکە و بەرهەمە هونەرییەکەیە لە یەکتر، چونکە گۆرنیکا وەکوو بیروباوەڕ لەناو زاتی پیکاسۆدا ناژی و لێی جیا بۆتەوە. بۆ ئەوەی پیکاسۆ لەم نامۆییە رزگار بێت، ئەوا پێویستە هەوڵ بدات بەرهەمە دەرچووەکەی جارێکی تر بکاتەوە بە موڵکی خۆی و داگیری بکات.

کارڵ مارکس، یەکەم زانایە رەخنەی لەم بۆچوونەی هیگڵ گرتووە و وەکوو ئەویش نەهاتووە هەموو بەرهەم و خوڵقاندێک بە نامۆیی دابێت. بۆ مارکس و زانایانی سەر بە راڕەوی مارکسیزم، لە کاتێکدا





بەرهەمێک ناوی نامۆیی پێ دەدرێت کە ئەو بەرهەمە لە ژێر دەستەڵات و موڵکیەتی خاوەنەکەیدا دەربچێت و ببێت بە موڵکی کەسێکی دیکە، ئەو کەسەش ئەو بەرهەمە بکات بە داردەستێک بۆ چەوساندنەوەی خاوەنی ڕەسەنی بەرهەمەکە. بۆ نموونە: بەرهەم لە کۆمەڵگایەکی سەرمایەداریدا کە منداڵی زاتی کرێکارە لە کرێکار سەندراوە و زەوت کراوە و لە هەمان کاتیشدا خاوەنی بەرهەمەکە (کرێکار)ی پێ چەوسێنراوەتەوە. لەبەر ئەمەش مارکس کۆمەڵگای سەرمایەداری بە کۆمەڵگایەکی نامۆی دادەنێت کە چینی کرێکار لە بەرهەمەکەی نامۆ کراوە و چەوساوەتەوە. هیگڵ، لە جێگایەکی تردا لە پەرتووکی (فینۆمینۆلۆجی هۆش)دا باسی جۆرێکی تری نامۆیی دەکات کە ئەم شێوەیە زیاتر بووە بە زەمینە بۆ تیۆریی نامۆیی مارکس و بە ڕای من مارکس زیاتر سوودی لەم تۆژینەوەیە وەرگرتووە. حەز دەکەم ئەوەش بخەمە ڕوو کە من ناڵێم مارکس دەقاودەقی بۆچوونەکەی هیگڵی دووبارە کردۆتەوە. ڕاستە مارکس لە فەلسەفەدا شاگردی هیگڵە و بە یەکێک لە ڕیزی چەپە هیگڵییەکانی وەکوو ئێدگار بۆیەر و ماکس شتێرنەر و موسس هێس و لودیویچ فیورباخ دادەنرێت،[٥٩] بەڵام جیاوازییەکی گەورە لەنێوانیاندا هەیە. مارکس لەم ڕووەوە دەڵێت: "دیالێکتیکی من وەنەبێت تەنیا لە دیالێکتیکی هیگڵ جودا بێت، بەڵکو دژی سیستەمەکەی هیگڵە."[٦٠] نامۆیی کرێکار لە فەلسەفەی مارکس و کۆمەڵگای سەرمایەداریدا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە (دیالێکتیکی کارکردن)ی هیگڵەوە هەیە. دیالێکتیکی کارکردن تیۆری و پراکتیک، بیر و کار، بەیەکەوە گرێ دەدات. بەڵام لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە کایەوە کە ئایا تیۆری پێش کارکردن دەکەوێت یان کارکردن تیۆری دروست دەکات؟

با وا تێنەگەین ئەم پرسیارە بەرەو زۆرانبازی و شەڕەکوتەکەی





ئایدیالیزم و ماتەریالیزممان دەبات یان دەمانگەڕێنێتەوە سەر مەسەلەی مریشک و هێلکەکە. هیگڵ و مارکس هەرچەندە سەر بە دوو فەلسەفەی جیاوازن و لە سیستەمە میتافیزیکییەکەیاندا دانوویان پێکەوە ناکوڵێت هێشتا لە ئاستی ئەم پرسیارەدا شیر و تیر لە یەک ناسوون و یەک وەڵامیان هەیە و هاوڕان. ئەویش پێشخستنی تیۆری و پاشخستنی کارکردنە (پراکسیس). مارکس بەئاشکرا کارکردنی مرۆڤ و ئاژەڵی جیا کردۆتەوە.[٦١] کارکردنی مرۆڤ ئاوەزان و هۆشەکین. مرۆڤ پێش ئەوەی بە کارێک هەڵبسێت بیری لێ دەکاتەوە و مەبەستەکەشی (غایە) لەلا ڕوون و ئاشکرایە. ئەوجا بڕیاردارنیش لەسەر کارێک هەڵبژاردن و ئازادیی مرۆڤەکە پیشان دەدات. هەموو کارێکی هەڵبژاردوو ئاوەز و هۆشمەندانەیە و لە زاتی مرۆڤەوە ڕێ دەکات و مرۆڤ بڕیاری لەسەر دەدات. من نامەوێت لێرەدا تەفسیرێکی وجودیانە (بوونخوازانە)ی مارکسیەت بکەم، بەڵام زانا مارکسیستە ئەرتەدۆکسییەکان (وشکبیرەکان) خۆیان لەم ڕاستییە لاداوە و مارکسیەتیان خستۆتە ناو بۆتەیەکی دۆگماتیکییەوە، ئەمانیش وەکوو چۆن چەند مەلایەکی وشکبیر تەفسیری (قورئان)یان کردووە، ئاوهاش ئەم زانایانە دەڕواننە مارکسیەت. جۆرج لۆکاش یەکێکە لە ڕابەرانی مارکسیزمی نوێ و بۆ یەکەم جار هەوڵیداوە دژی بیروڕاکانی زانا وشکبیرەکان بوەستێت و مارکسیەت لەناو گۆمی وەستاوی دۆگماتیکی ڕزگار بکات و سیمایەکی مرۆڤایەتی پێ بدات. ئەگەر مارکس وەکوو هایدیگەر و سارتەر بڕوای بە سەربەستیی مرۆڤ نەهێنایە نەیدەتوانی باسی دیالێکتیکی کارکردن بکات.

وەکوو باسکرا، مارکس و بوونخوازەکان (وەکوو هایدیگر و سارتەر) نامۆیی بە ناچارەبوونێکی میتافیزکی دانانێن و لەو باوەڕەدان کە ڕووداوێکی مێژووی و کاتییە نەک حاڵەتێکی لە دەستەڵات بەدەر. مارکس، بە پێچەوانەی هیگڵی مامۆستای و زانا بوونخوازەکانیشەوە، ڕێچکەیەکی ئابووری گرتۆتە بەر و نامۆیی بەستۆتەوە بە چەوساندنەوەی چینایەتییەوە و ئیتر شێوەکانی دیکەی





نامـۆیی فـەرامـۆش کـردووە. بە ڕای ئەم نامـۆیی لەگـەڵ سـەرهەڵدانی مـوڵکایەتیی تایبـەتی و دابەشـبوونـی کۆمـەڵ بەسـەر چینەکـانـدا دێتە کایەوە. هەروەهـا بە لەناوبردنی ئەم دەسـتگا ئابوورییە و لـەناوچوونی جـیـاوازیی چینایەتیش نامــۆیی لەناو دەچێت. لە کـۆمــەڵگایـەکی سـۆشـیـالیـسـتـیـدا، بۆ نموونە، لـەبەر ئەوەی چینی کرێکار خـاوەنی بەرهەمی خـۆیەتی و چینـە سەرمـایەدارییـەکە نایچـەوسـێنێتـەوە، نامـۆ نیـیـە. بـەرهـەم کـە مـەوزوعـیـەتێکی داگـیـرکـراوی کـرێکـارە و لە ژێر دەسـتـەڵاتی سـەرمـایەدارییـدایە دەگـەڕێتـەوە بۆ کـرێکار و دەبێت بە مـوڵکی ئـەو. مـارکس، لێـرەدا، جـارێکی تر دژی هیگڵ دەوەسـتـێت و بەرهەم لە کۆمـەڵگای سۆشیالیستیدا، کە مەوزوعیـەتی زاتی کرێکارە، بە نامـۆ دانانێت. بێگومـان چارەسـەرکردنی نامـۆیی ئابووریی چینی کـرێکار بە لـەناوبردنی کـۆمــەڵگای سـەرمـایەداری تەنیـا ڕێگایەکی ئاوەزان و لۆجـیکمـەندانـەیە کـە تاکـو ئـەمـڕۆ زانایەکی دیکە نـەهاتووە بەرپـەرچی مـارکس بداتەوە یان چارەسـەرێکی باشـتـرمـان بخـاتە بەردەم. بەڵام ئایا نامـۆیی کـە بـارودۆخێکی تایبـەتی بوونی مـرۆڤە بە تەنیـا ئابوورییــە و هـیــچی تر؟ دروســتـــە مــرۆڤ لە کــۆمــەڵگای سۆشیالیستیدا بە دەستی چینی زۆردار ناچەوسێتەوە و بەرهەمیش لە ژێر دەسـتـەڵاتی چەند کەسێکدا نییە، بەڵام کێ دەڵێت ئیـتر مـرۆڤ تووشی نـامـۆیی نابێت؟ ناتوانین بڵـێین کـە شـێـوەکانی تری نامـۆیی (جگە لـە ئابووری) لەگـەڵ لەناوبردنی نـامـۆیی ئابووریدا سـەرەونگووم دەبن و مـرۆڤ لە هـەمـوو ڕوویەکـەوە (لە کۆمـەڵی سـۆشـیـالیـسـتـیـدا) خـاوەنی زاتی خـۆیەتی و سـەربەسـتـە. مـارکس باسـی شـێوەکانی تری نامۆیی ناکات و تەنیا ئاماژەی بۆ نامۆیی ئابووری کردووە. ئەمەش بە تـەنیــا گلـەیی و بیـــروڕای ئێـــمـــە نیـــیـــە، بەڵکو ڕای زۆر زانـای مـارکسـیـسـتـیـشـە. جـۆرج لۆکـاش[٦٢] و ئادەم شـاف[٦٣] و ڕۆجیـە گـاروودیش[٦٤] لەو باوەڕەدان کـە کۆمـەڵگای سـۆشـیـالیست ڕیشـە و ڕەگەی هەموو جۆرە نامۆییەک لە بنجدا دەرناهێنێت.[٦٥]

# تاک و کۆمەڵ

پەیوەندییەکانی نێوان تاک و کۆمەڵ دیالێکتیکیانە لەلای هیگڵ باسکراوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هیچ لایەنێکیان نەکراوە بە قوربانی لایەنەکەی دیکە. بەڵام وا دەردەکەوێت کە لە هەندێک قۆناغی گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵ و مێژوودا لایەکی تەرازووی ئەم پەیوەندییە گرانتر دەبێت و لایەنەکەی دیکە دەخاتە ژێر کارتێکردنەوە. لە قۆناغێکدا کە هیگڵ ناوی دەنێت (Ethical life) تاک بە تەواوی کەوتۆتە ژێر کارتێکردنی کۆمەڵەوە و پێڕەوی ئەو نەریت و بەهایانە دەکات کە کۆمەڵەکەی دایناون و ناتوانێت گەردێک لەم ڕێگەیە لا بدات. ئەم نەریت و بەهایانەش، بەگوێرەی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەم قۆناغە هەمەکین و گۆڕانیان بەسەردا نایەت و تاکەکانیش، بەبێ ئەوەی بیر لە بەرژەوەندیی خۆیان بکەنەوە، ناچارن پێڕەوی بکەن. بۆ نموونە: ئەگەر کۆمەڵ باوەڕی بەو بەهایە بێت کە درۆکردن خراپە ئەوجا درۆکردن هەمیشە خراپە و ئەگەر تاکێک سەریشی بڕوا دەبێت ڕاستگۆ بێت و بە هیچ شێوەیەک درۆ نەکات. بێگومان ئەم شێوەژیانە ڕەوشتییەی هیگڵ لەم قۆناغەدا ئاماژەی بۆ دەکات وابەستە بەو تیورە ئاکارەوە (Deontology) کە کانت و شاگردەکانی باسیان کردووە. ئەم تیورە بیر لە ئاکامی کردەوەکانمان ناکاتەوە و باوەڕی بەوە نییە کە درۆکردن هەندێک جار باشە. ئەگەر من ئەندامی ڕێکخراوەیەکی شۆڕشگێڕ و دژ بە دەوڵەت بم، ئەوا ناتوانم لە دادگادا ڕاستگۆ بم و درۆ لەگەڵ دەوڵەتدا نەکەم و هەرچی ڕاز و نهێنیی ڕێکخراوەکەم هەیە بیدەمە دەستیان. لەم حاڵەتەدا، درۆکردن ئاکامێکی باشی هەیە و کەوابوو درۆکردنەکەشم باشە.[٦٦]

لەم قۆناغەدا تاک لە ئاستی کۆمەڵدا دژەبابەتە و هەوڵ دەدات گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوو بخوڵقێنێت و قۆناغێکی نوێتر بهێنێتە کایەوە. ئەم دوو لایەنە دژوارە دیالێکتیکییە خاوەنی بەها و نەریتی جودان. کۆمەڵ لە ڕێگەی بەها هەمەکییەکان و نەریتە کۆمەڵایەتییەکانەوە بوونی خۆی دەسەلمێنێت. تاکیش خۆی دەکات بە خاوەنی هەڵبژاردنی خۆی و بەهاکانی. لەم نێوانەدا، ناکۆکی دەکەوێتە نێوان بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵ و تاکەکانەوە و لە دیدی (هیگڵ)ەوە تاک پەنا دەباتە بەر نەریت و بەرژەوەندیی خێزانەکەی و ئەم بەرژەوەندییەش لە سەروو بەرژەوەندیی کۆمەڵەوە دەدانێت.[٦٧]

خێزان بۆ هیگڵ دەستگایەکە کە بناغەکەی لەسەر دوو کۆڵەکە دامەزراوە: عاتیفە و ڕەوشت. ئەندامەکانی خێزان یەکتریان خۆش دەوێت و لە ئاستی یەکتریشدا بەرپرسیارن. لە قۆناغی پێشوودا تاک بۆ کۆمەڵ دەژیا، لەم قۆناغەدا خۆی بە ئەندامێکی دڵسۆزی خێزانەکەی دادەنێت و خێزانەکەشی ڕاستەوخۆ پێویستییەکان جێبەجێ دەکەن. هەروەها پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەندامانی دیکەی خێزانەکەیدا ڕاستەوخۆ و پتەوە. ئەمەش کارێک دەکات کە تاک لە ئاستی بوونی خۆی و بەرژەوەندییەکانیدا بەئاگا و ئاوەزان بێت. خود ــ ئاگاییش لە نەریت و بەها هەمەکییەکانی کۆمەڵی دوور دەخاتەوە. تەنانەت ئەو بەها هەمەکییانە بە کۆسپ و لەناوچوونی سەربەستییەکەی دادەنێت کە لەگەڵ بەهاکانی ئەودا ناکۆک و دژوار دەبن. باشترین نموونەی ئەم جۆرە ناکۆکییە لە دیدی (هیگڵ)ەوە هەڵوێستی (ئەنتیگۆن)ی پاڵەوانی شانۆگەرییەکەی (سۆفۆکلیس)ە.[٦٨] هیگڵ نەهاتووە لە هەموو کێشەکانی شانۆگەرییەکە بکۆڵێتەوە و بۆ لێکدانەوەی بۆچوونە فەلسەفییەکانی خۆی سوودیان لێ وەربگرێت. میتافۆری ئەنتیگۆن بە تەنیا ئاماژە بۆ ناکۆکییەکانی نێوان تاک و





کۆمەڵ دەکات. هەروەها کۆمەڵ لەم میتافۆرەدا لە دەوڵەت جیا نەبۆتەوە و هەموو بەها هەمەکییەکانی کۆمەڵ بە هۆی دەستگا و دەستەڵاتی دەوڵەتەوە سەپێنراون و بەسەر تاکەکاندا ساغ بوونەتەوە. لەم شانۆگەرییەدا پۆلینیسس (برای ئەنتیگۆن) بە یارمەتیی دوژمنانی پادشای شارەکە (کریۆن) هێرش دەکاتە سەر (کریۆن) و دەیەوێت رژێمەکەی بگۆڕێت. لە ئاکامی جەنگێکی خوێناوییدا پۆلینیسس لە دەرەوەی شار دەکوژرێت و پادشا فەرمان دەکات کە نەنێژرێت و لاشەکەی ئاژەڵ بیخوات. بەگوێرەی نەریت و بەهای ئەو شارە پۆلینیسس خائنە و دەبێت بە سزای خۆی بگات. بەگوێرەی یاسای خێزانەکەی و ئەنتیگۆنی خوشکی، پێویستە پۆلینیسس بنێژرێت و پرسەشی بۆ دابنرێت.

ئەنتیگۆن وەکوو خوشکێک ناشتنی تەرمی براکەی بە ئەرکێکی پیرۆز دادەنێت. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش لە یاسای دەوڵەتەکەی یاخی دەبێت و دەچێت تەرمی پۆلینیسس دەنێژێت.

ئەنتیگۆن: ئەمە بڕیاری خوداوەند نییە. من باوەڕم بەو دادپەروەرییە نییە کە دەستەڵاتدارەکان بۆ بەرژەوەندیی خۆیان دایدەنێن.

ئێستا من لە ژێر دەستی تۆدام، لە کوشتن زیاتر چی سزایەکم دەدەیت؟

کریۆن (پادشا): نا. جگە لە کوشتن هیچی ترت بۆ ناخوازم.

ئەنتیگۆن: چاوەڕوانی چی دەکەیت؟ بێجگە لە ناشتنی تەرمی براکەم هیچی تر بۆ من گرنگ نییە. من لەم ڕێگەیەدا شانازی بە مردنەوە دەکەم.[٦٩]

هەڵوێستی یاخیبووی ئەنتیگۆن ئاماژە بۆ زۆرانبازیی نێوان تاک و کۆمەڵ یان تاک و دەوڵەت دەکات، بەڵام هیگڵ داواکارییەکانی

ئەنتیگۆن و دەوڵەت یان بەهاکانی ئەنتیگۆن و دەوڵەت بە هەمەکی دادەنێت. جیاوازیی نێوان ئەم دوو جۆرە بەهایە لەوێدایە کە بەها و یاسای دەوڵەتی لە ژوور یاسا و بەهای خێزانەوەیە کە لە ڕێگەی تاکێکی وەکوو ئەنتیگۆنەوە خۆی دەردەخات. هەروەها بەها و یاساکانی دەوڵەت لە دیدی (هیگڵ)ەوە دەستکردی پیاوە، چونکە پیاو لە چوارچێوەی سنووری خێزان دەردەچێت و بازنەیەکی فراوانتر بە چواردەوری خۆیدا دەکێشێت. ئافرەت، بە پێچەوانەی پیاوەوە، هەوڵ دەدات لەنێوان سنووری خێزاندا بمێنێتەوە و پارێزگاریی بەهاکانی دەکات.[٧٠] کێشە ناکۆکەکەی نێوان ئەنتیگۆن و دەوڵەت بە شێوەیەکی دیکەش لێک دەدرێتەوە. بەهاکانی دەوڵەت داهێنراوی پیاوە و هێمای پیاوسالارییە. ئەنتیگۆن و هەڵوێستی ئەنتیگۆن نوێنەری بەهاکانی ئافرەتە. لەم زۆرانبازییە دیالێکتیکییەدا و لەم قۆناغەدا ئەنتیگۆنی ئافرەت بووە بە هێزی ڕەتدانەوە و دژەبابەت، کە بەبێ ئەم گۆڕانکاری ڕوو نادات و هێزە دیالێکتیکییەکانیش قۆناغێکی نوێتر ناخوڵقێنن.

هیگڵ هەوڵی داوە لە (میتافۆری ئەنتیگۆن)دا پەیوەندیی پیرۆزی نێوان خوشک و برا نیشان بدات کە پەیوەندییەکە بە پێچەوانەی پەیوەندی نێوان ژن و مێردەوە بنەمایەکەی سێکسی نییە و بە پێچەوانەی پەیوەندی نێوان باوک و دایک و منداڵیشەوە، کە باوک و دایک لە ڕێگەی منداڵەکانیانەوە خۆیان لە داهاتوودا دەبینن، وابەستە بە ئازادی و هەڵبژاردنی خوشک و براکەوە. خوشک و برا بۆ مەبەستی سێکس یەکدیان خۆش ناوێت و لە بوونی یەکتریشدا داهاتوو نابینن. هەردووکیان لە ئاستی یەکدیدا بەرپرسیارن و هیچ کەسێک جێگای برا بۆ خۆشک و جێگای خوشکیش بۆ برا ناگرێتەوە.[٧١]

سەرهەڵدانی هەڵوێستی یاخیبووانەی تاک (وەکوو ئەنتیگۆن) مژدەی قۆناغێکی نوێترمان دەداتێ کە وابەستە بە خواست و





بەهاکانی تاکەکانەوە و ئەمەش کۆمەڵگای مەدەنی پێک دەهێنێت. کۆمەڵگای مەدەنی کە دژەبابەتی قۆناغی پێشووترە، ئەنارکیزم و شێوانی یاسا و بەرەڵایی نییە. لە کۆمەڵگای مەدەنیدا تاکەکان لە ژێر کارتێکردنی بەها هەمەکییەکانی دەوڵەت و کۆمەڵدا هەڵناسوورێن. تاکەکان بەهای خۆیان هەیە و بەگوێرەی بەرژەوەندی و پێویستییەکانی ژیانیانەوە بە (عەقد) پێکەوە بەستراون و یاسای دەوڵەتیش رێزی سەربەخۆیی تاکەکان دەگرێت و لە هەمان کاتیشدا پارێزگاری ئەو سەربەخۆییە دەکات.

رۆشنگەری (تەنویر) لە مێژووی شارستانیەتی رۆژئاوادا لەم قۆناغەدا سەری هەڵداوە و بووە بە فەلسەفەی کۆمەڵگای مەدەنی و وەکوو دژەبابەتێکی دیالێکتیکی رەتدانەوەی خەفەکردنی بیروباوەڕ و بۆچوونی بەرفراوانی بیرکردنەوەی مرۆڤە. رۆشنگەری باوەڕی بە سەربەستیی بیرکردنەوە هەیە و دژی کۆتدانان و پەرژینهەڵبەستنە بە دەوری بینین و تۆژینەوەی ئازاددا. یەکێک لەو هێزانەی کە لە بوارەکان بیرکردنەوەی سەربەست دەگرێت ئایینە و ئایینیش باوەڕی بە بوونی رەها و راستەقینەی رەها هەیە. لەبەر ئەمەش رۆشنگەری رەتی راستەقینەی رەها دەداتەوە و ئەو راستەقینەیە ناکات بە ناوەرۆک بۆ بۆچوونە فەلسەفییەکانی خۆی و بە دوای ناوەرۆکێکی نوێدا دەگەرێت.[٧٢]

پرۆژەی رۆشنگەری، وەکوو بزووتنەوەیەکی فەلسەفییانە، رێگەی بۆ شۆرشی بورجوازی فەرەنسا خۆش کرد و بوو بە یەکێک لە هۆکارەکانی. هیگڵ، لە تەمەنی لاوێتیدا، لەو کاتەدا کە شۆرشی فەرەنسا سەرکەوت و دەستگای دەرەبەگایەتی و بەها کۆنەپەرستیەکانی سەدەکانی ناوەراستی رووخاند، ئەم باوەڕێکی تەواوی بە شۆرش و ئایدیۆلۆجیای شۆرشەکە هەبوو. بەڵام پێشوازیکردنی شۆرشەکە لە لایەن هیگڵەوە و باوەرکردن بە ئاڵا و بەهاکانی هێدی هێدی رووی دەکردە بێباوەرکردن و دوورکەوتنەوە لە ئامانجەکانی شۆرش، چونکە شۆرشی بۆرجوازیی فەرەنسا (کە هیگڵ



بە کۆتایی مێژووی دادەنا) بوو بە ڕژێمێکی زۆردارانە و زاڵم و خەڵکی بۆ دەوڵەت بوون بە دوژمن. لە ئەنجامی ئەمەدا بەها هەمەکییەکان بوون بە موڵکی تاکەکەسێک (دیکتاتۆر) کە بەرانبەر کۆمەڵ ڕاوەستا و دەسەڵاتی خۆی لە سەروو دەسەڵاتی ئەویشەوە دانا و سەربەستییەکەی خۆشی بە ڕەها و لەحەدبەدەر تەماشا دەکرد. ئەم تاکەکەسە، کە خۆی بە خاوەنی بەها هەمەکییەکان دادەنێت، وا بیر دەکاتەوە کە ئەوەی ئەم باوەڕی پێکردووە، دەبێت هەموو کەسانی دیکە باوەڕی پێ بهێنن و ئەوەی ئەم بە باشی دەزانێت ئەوا بۆ هەموو کەسێکیش باشە.[٧٣] بۆ ئەوەی دیکتاتۆر بوونی سەربەستییە ڕەهاکەی خۆی بسەلمێنێت، بەم شێوەیە، سەربەستیی کەسانی دیکە ڕەفز دەکات و بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەم کارەشی پەنا دەباتە بەر تێرۆر و کوشتن و لەناوبردنی هێزە بەرهەڵستەکان. کۆمەڵ دەبێت بۆ دەوڵەت بژی و دەوڵەتیش دەستگای تاکەکەسێکی دیکتاتۆرە.

ئەم گۆڕانە تراژیدیاییە لە مێژووی کۆمەڵدا، بەتایبەتی کۆمەڵی ڕۆژئاوا، پاش شۆڕشی فەرەنسا، وابەستە بە بۆچوونی فەلسەفییانەی ڕۆشنگەری و ناوەڕۆکە (تەجرید)ەکەی. ڕۆشنگەری، بەو نیازەی سەربەستیی تاک مسۆگەر بکات یان ئەو سەربەستییە بە هەموو تاکەکانی کۆمەڵ بدات ئەوا ئەو دوو هێزی ناکۆکی دیکەی بۆ هێنایە کایەوە. لە لایەکەوە، بەو پێیەی کە مرۆڤ سەربەستە، سەربەستیی ڕەها دا بە تاکێک و مرۆڤێکی دیکتاتۆری بۆ خوڵقاندین، ئەم دیکتاتۆرەش دژی لایەنە ناکۆکەکەی دەوەستێت و سەربەستیی تاکەکانی دیکە زەوت دەکات و جگە لە توانا و دەسەڵاتی خۆ باوەڕ بە چی دیکە ناهێنێت. بەم شێوەیە هیگڵ بڕوای بە شۆڕش نامێنێت و ڕوو دەکاتە بیروباوەڕی ڕژێمێکی ڕامیاریی پاشاگەری کە لەسەر پێڕەوی (Constitution) پەرلەمانی دەوڵەت دەبات بە ڕێوە. لەم حاڵەتەدا دەسەڵاتی پاشا، بە پێچەوانەی دەسەڵاتی دیکتاتۆرەوە و بەو حوکمەی کە بەگوێرەی پێڕەوی دەوڵەت و پەرلەمان حوکم دەکات، سەربەستی و دەسەڵاتی مەحدود دەبێت.[٧٤]

# لۆجیکی دیالێکتیکی

لەسەرەتاوە باس کرا کە پێویستە لە فەلسەی هیگڵدا لە لۆجیکەوە قۆڵی لێ هەڵکەین و لە کێشە کۆمەڵایەتی و ڕامیارییەکان بکۆڵینەوە. هەروەها هیگڵ خۆشی نەخشەی بیروباوەڕەکانی لەسەر سێکوچکەی (لۆجیک، سروشت و ئاگامەندی) دادەنێت. بەڵام ئێمە لەبەر گرنگی ئەو کێشانەی لە فەلسەفە ئەنترۆپۆلۆژییەکەیدا باس کراون، کە کارتێکردنێکی مەزنی کردۆتە سەر فێرگە فەلسەفییەکان پاش خۆی، بە باشمان زانی لەوێوە سەرەتای گەشتەکەمان دەست پێ بکەین و ئەم تەقلیدەش لە ڕاڤەکردن و تۆژینەوەی فەلسەفەی هێگڵدا لەناوبەرین. بەڵام لێرەدا ناچارین کەمێک باسی لۆجیکەکەی هیگڵ بکەین و ئاماژە بۆ خەسڵەتەکانی و گرنگی ئەم سیستەمە بکەین.

واژەی (دیالێکتیک) یۆنانییە و لە (dialektike techne) واتە هونەری دیالێکتیک (جەدەل) هاتووە. ئەمەش هونەرێکی جەدەلی بوو بۆ یەکەم جار زینۆی ئیلیا، کە لە سەردەمی چوارەمی پێشزاییندا ژیاوە، بە کاری هێناوە و بۆ بەرگریکردن لە بیروباوەڕەکانی (پارمەنیدس)ی مامۆستای خستویتیە کار.[٧٥] سۆفیستەکان وەکوو پرۆتاگۆراس و جۆرجیاس بۆ جیاکردنەوەی بیروباوەڕی فەلسەفییانەی دروست و نادروست لە یەکدییەوە، پەنایان بردە بەر دیالێکتیک. دوای ئەمان سوکرات و دوای سوکراتیش ئەفلاتون سوودی لەم شێوازەی جەدەل وەرگرتووە و لە فەلسەفەکەیاندا بە کاریان هێناوە.[٧٥] زانا موسوڵمانەکانیش وەکوو شاگردانی فێرگەی موعتەزیلە لە شارەکانی بەسرە و بەغداد لە ژێر کارتێکردنی فەلسەفەی یۆنانیدا سوودیان لە دیالێکتیک وەرگرتووە.[٧٦]

لە سەردەمی نوێدا کانت باسی دیالێکتیکی کردووە و لە پەرتووکەکەیدا (*Critique of Pure Reason*) بەشی سێیەمی ناو ناوە "Transcendental Dialectic"، کە لەوێدا ئەم زانایە خۆی لە قەرەی کێشە میتافیزیکییەکان وەکوو بوونی خوا و بوونی دەروون دەدات و ڕەخنە لەو بەڵگەنامانە دەگرێت کە زانا ئایدیالیستەکان بۆ سەلماندنی بوونی خوا و دەروونی مرۆڤ دایانمەزراندووە. بێگومان کانت لە ئاکامی ڕەخنە و لێکۆڵینەوەکەیدا گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی کە سەلماندنی ئەم دوو جۆرەی بوون لە ڕێگەی لۆجیکەوە مەحاڵە و مرۆڤ (هەرگیز) ناتوانێت بوونیان بناسێت. لەم بۆچوونەوە کانت دیالێکتیک بەو ڕێگەیە دادەنێت کە مرۆڤ دەگەیەنێتە دووڕییانەیەکی ناکۆک و بێچارەسەری.[٧٧] لەگەڵ هیگڵدا لۆجیکی دیالێکتیک هاتە کایەوە و لە سیستەمێکی تەواودا دامەزرا. ئەم سیستەمەش بە بیروڕای هیگڵ سیستەمی جیهان و گۆڕانکارییەکانی ناو جیهانە و بوونی ڕەها (The Absolute) دایهێناوە و هیگڵ دۆزیویەتییەوە و بە ئێمە دەناسێنێت. با بزانین خەسڵەتە سەرەکییەکانی لۆژیکی دیالێکتیک چین و چۆن لە لۆجێکی ئەریستۆ جیاوازن؟

یەکەم: لۆجیکی ئەریستۆ لەسەر بنەمای یاساکانی بیر، بەتایبەتی یاسای (Identity) دامەزراوە. بۆ نموونە کە دەڵێین (ئەلف) ئەلفە، ئەوا ئیتر کەس ناتوانێت بڵێت کە ئەلف ئەلف نییە، چونکە ئەم یاسایە ناکۆکی لە خۆیدا هەڵناگرێت. هەروەها لە دیدی ئەریستۆوە شاگردەکانی (نەبوون) نابێت بە سەرچاوەی (بوون) یان شتێکی هەبوو لە هیچەوە پەیدا نابێت. کە دەڵێین شتێک هەیە، ئەوا پێویستە لە پێش ئەمدا شتێکی تر هەبووبێت کە شتی دووەمی لێوە دەرچووبێت. لۆجیکی دیالێکتیک لەگەڵ ئەم دوو خاڵەدا هاوڕا نییە و یاسای ناکۆکی (Contradiction) دەکات بە خەسڵەتێکی سەرەکیی





بیرکردنەوە و یاساکەی ئەریستۆ بە (مجەرەد) دادەنێت و باوەڕ بە ڕاستەقینەی کۆنکرێتی و هاوتادانانی کۆنکرێتی دەهێنێت. لە دیدی هیگڵەوە هەموو کێشەیەکی پۆزەتیڤی وەکوو (ئەلف ئەلفە.) یان (مرۆڤ مرۆڤە.) لەناو خۆیدا ناکۆکە و ڕەتدانەوەی ڕاستەقینەیەکی ترە. لەکاتێکدا دەڵێین (پشیلەکە ڕەشە.) مەبەستمان ئەوەیە کە (پشیلەکە سپی نییە.) هەروەها ناکۆکی لە دیالێکتیکدا بووە بە هێز و توانای گۆڕانکارییەکان، لە قۆناغەکانی مێژووی شارستانیەتدا یان لە بیرکردنەوەی مرۆڤدا ناکۆکییەکان گۆڕانکاری دەخەنە پێش و هانی مرۆڤ دەدەن بۆ لەناوبردنی ئەم ناکۆکییانە ڕوو بکەنە قۆناغێکی باشتر و پێشکەوتووتریش. لەبەر ئەم هۆیەشە کە هەموو ئەو زانایانەی پێڕەوی لۆجیکی دیالێکتیک دەکەن باوەڕیان بە گۆڕان بەرەو پێشکەوتن هەیە و قۆناغێکی نوێ لە قۆناغەکانی پێشتر بە باشتر و پێشکەوتنخوازتر دادەنێن.

وەنەبێت قۆناغە نوێیەکە لە ناکۆکی بەدەر بێت، ئەمیش بەقەدەر خۆی ناکۆکی تێدایە و ئاگامەندی هەوڵ دەدات خۆی بگەیەنێتە قۆناغێکی باشتر و بەم شێوەیە ئاگامەندی بە بەردەوامی بە گۆڕانە دیالێکتیکییەکەیدا تێ دەپەڕێت.[٧٨] هەروەها هیگڵ لەو باوەڕەدایە کە بوون و نەبوون لەناو یەکدان و تێهەڵکێشراون. ئەمەش لە بەشی یەکەمی سیستەمی لۆجیکدا ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: گۆڕانە دیالێکتیکییەکان لە بابەتەوە بۆ دژەبابەت و ئەوجا بۆ تێهەڵکێش دەڕوات. دژەبابەت لەگەڵ بابەتدا ناکۆکە و دژی دەوەستێت و بەڵام لە هەمان کاتدا لەناو منداڵدانی بابەتدا لە دایک دەبێت. بابەت و دژەبابەت دەکەونە زۆرانبازی و هەوڵ دەدەن بەسەر ناکۆکییەکاندا زاڵ بن، ئەم زاڵبوونەش کە ناکۆکییەکان لە ناو دەبات لە قۆناغی سێیەمدا بە ناوی (تێهەڵکێش) ڕوو دەدات. تێهەڵکێش لە





بابەت و دژەبابەت دەوڵەمەندترە، چونکە هەردووکیانی لەناو خۆیدا هەڵگرتووە. ئەوجا تێهەڵکێش دەبێتەوە بە بابەتێکی تازە و دژەبابەتەکەی سەر هەڵ دەدات و دەکەونە زۆرانبازی و ناکۆکییەکانی نێوانیان لە تێهەڵکێشێکی نوێتردا دەتوێنەوە، ئەم گۆڕانکارییەش کە لە گۆڕانکاریی میکانیکییەوە (واتە: گۆڕانکاری بە ڕێگەی کارتێکردنی هۆکار لەسەر ئەنجام) جیاوازە و دیالێکتیکییە.

سێیەم: دژەبابەت ڕەتدانەوەی (نێگەتیڤی) بابەتە و تێهەڵکێش ڕەتدانەوەی ئەم ڕەتدانەوەیەیە (نێگەتیڤی نێگەتیڤە) یان وەکوو هیگڵ دەڵێت: "دوو نێگەتیڤە". ڕەتدانەوەیش خەسڵەتی کێشەیەکی نێگەتیڤی لۆجیکی وەکوو "دارگۆچان، مار نییە." نییە، بەڵکو لەناو هەموو شتێکدا هەیە. وەکوو باسکرا کێشە پۆزەتیڤەکانیش وەکوو "پشیلەکە ڕەشە." لەناو خۆیدا نێگەتیڤە، چونکە ڕەتدانەوەی خەسڵەتێکی ترە کە پشیلەکە نییەتی. جیاوازیی نێوان کێشەی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ لەوەدایە کە کێشە نێگەتیڤەکە بە ئاشکرا ڕەتدانەوەکەی بە ڕێگەی واژەی (نییە) دەربڕیوە و دەرخستووە، بەڵام کێشە پۆزەتیڤەکە نەیتوانیوە ڕەتدانەوەکە دەربخات.[٧٩]

چوارەم: لۆجیکی دیالێکتیک، بە پێچەوانەی لۆجیکی ئەریستۆوە، باسی جۆرەکانی کێشە و دروستی و نادروستییان ناکات. کاتیگۆرییەکانی لۆجیکی دیالێکتیک ئەو بنەما هۆشەکییەن کە جیهان و گۆڕانکارییەکانی ناو جیهانی لەسەر ڕاوەستاوە. هەروەها ئەم کاتیگۆرییانە دەستکردنی هۆش و تێگەیشتنی مرۆڤ نین، بەڵکوو ئۆنتۆلۆژییانەن و خاوەنی بوونی خۆیانن.[٨٠]

ڕەتدانەوەی (نێگەتیڤ) هێزی ڕووخان و دامەزراندنە. لە لایەکەوە ڕەتدانەوەی بابەتە و ڕووخاندنی دەستگا و بیروباوەڕێکی دامەزراوە، لە لایەکی تریش هەڵچنین و دامەزراندنی دەستگا و بیروباوەڕێکی





نوێترە، کە لەناو خۆیدا دووبارەبوونەوە و گەڕانەوە بەرەو پاش قبووڵ ناکات. لەبەر ئەمەشە گۆڕانکاریی دیالێکتیکی بە پێشکەوتنخواز دادەنرێت، چونکە ئیحتمالی گەڕانەوەی نییە و هەمیشەش قۆناغی نویێ لە قۆناغی پێشتر لە خۆی باشتر و دەوڵەمەندتر و بەرزترە.

بەتێکڕا، هەروەها بەگوێرەی دابەشکردنە سێکوچکەییەکەی هیگڵ، لۆجیکی دیالێکتیک کراوە بە سێ بەشەوە:

١ــ ڕاڕەوی بوون (Being).

٢ــ ڕاڕەوی ناوەڕۆک (Essence).

٣ــ ڕاڕەوی چەمک (Notion).

هەریەکێکیش لەم ڕاڕەوانە کراون بە سێ بەشەوە:

١ــ ڕاڕەوی بوون

ا. چۆنیەتی.

ب. چەندەکی.

ج. پێوانە (پێوەر).

٢ــ ڕاڕەوی ناوەڕۆک

ا. ناوەڕۆک.

ب. ڕوواڵەت.

ج. ڕاستەقینە.

٣ــ ڕاڕەوی چەمک

ا. چەمکی خودی (زاتی).

ب. چەمکی بابەتی.

ج. چەمکی ڕەها.

دیسانەوە هەریەکێک لەمانە سێ بەشیان هەیە کە هەریەکەیان لە شوێنی خۆیاندا بەگوێرەی گۆڕانە دیالێکتیکییەکان بابەتن و دژەبابەتی خۆیان دەدۆزنەوە و لەگەڵیدا تێهەڵکێش دەبن.





هەریەکێک لەم ڕاڕەوانە چارەسەری چەند کێشەیەکی گرنگ و تۆژینەوەی چەند کاتیگۆرییەکە کە لەبەر ڕۆشنایی ئەمانەوە تەفسیری بوون دەکرێت. بۆ نموونە لە ڕاڕەوی بووندا، کاتیگۆرییەکانی وەکوو چۆنیەتی و چەندەکی و پێوەر لەناو خۆیاندا باسی بوونی گشتگر و بوونی ناسراو و گەلێک کێشە و مەسەلەی تر دەکەن، ەک لێرەوە هیگڵ هەوڵ دەدات لە تێهەڵکێشکردنی ئەمانەدا خۆی بگەیەنێتە ناوەڕۆکی بوون. دەبینین، لۆژیکی هیگڵ، کە هەرچەندە ئایدیالیستانەیە (واتە: لۆژیکی ئاگامەندییە، نەک ماتەریالی) لە بوونەوە دەکەوێتە ڕێ و بوون دەکات بە بابەت و ناوەڕۆک (وەکوو دژەبابەت) پاش بوون دێت. بوون و ناوەڕۆک، کە بابەت و دژەبابەتن، لە ئەنجامی ناکۆکییەکانیاندا دەکەونە ناو تێهەڵکێشەی چەمکەوە و چەمکیش پاش تێپەڕبوونی بە گۆڕانە سێکوچکەییەکەیدا (لە چەمکی خودییەوە بۆ بابەتی و ئەوجا بۆ چەمکی ڕەها) دەبێتەوە بە بابەتێکی نوێ بۆ دژەبابەتێکی دیکە و (سروشت) لێرەدا لۆژیکی هیگڵ دەگاتە دواپلەی پەرەسەندن و پێشکەوتن و کۆتایی بە گۆڕانکارییەکانی دێنێت. لەگەڵ پەیدابوونی دژەبابەتی سروشت بۆ جیهانی ئاگامەندی لۆژیک، ئاگامەندی هەوڵ دەدات ناکۆکییەکانی خۆی لەگەڵ سروشتدا چارەسەر بکات و لەوێوە خۆی دەگەیەنێتە تێهەڵکێشکی نوێ کە هیگڵ ناوی دەنێت فەلسەفەی هۆش یان (ئاگامەندی) کە مەڵبەندی ئەو ناکۆکی و کێشە کۆمەڵایەتییانەیە لەم پەرتووکەدا ئاماژەمان بۆ هەندێک لایەنی کردووە.





# پەراوێزەکان

(١) Solomon, Robert. *In the spirit of Hegel. A study of G. W. F. Hegel's phenomenolgy of Mind*. Oxford University Press. 1983. p.35.

(٢) جوهان هولدرلین (١٧٧٠-١٨٤٣) هۆنەرێکی ئەڵمانە، لە شاری لاوفن هاتۆتە دنیاوە. هاوڕێی هیگڵ، شیلنگ و شیللەر بووە و لە تیوبنگن لەگەڵ ئەماندا خوێندویەتی. لە ساڵەکانی دوایی ژیانیدا بە شێتی ژیا و هۆنراوە ڕۆمانتیکیەکانیشی کاریان کردۆتە سەر بیروباوەڕی مارتن هایدیگر.

(٣) شۆپنهاوەر لە زانکۆی (گویتنگن)ەوە چووە بەرلین و لەوێوە بۆ جینا بەو نیازەی بازاڕی هیگڵ بشکێنێت، بەڵام ژمارەیەکی کەم لە خوێندکاران دەچوونە دەرسەکانیەوە و نەیتوانی زیان بە هیگڵ بگەیەنێت.

(٤) ئەم گۆڤارە شیلنگ و هیگڵ بڵاویان دەکردەوە. یەکەم نووسراوەی هیگڵیش بە ناوی (جیاوازی نێوان سیستەمەکانی فیختە و شیلنگ) لەم گۆڤارەدا بڵاوکراوەیەوە.

(٥) Harris, H. S. *Hegel's Development, Night Thoughts* (Jena 1801-1806). London: Oxford University Press. 1983. P.xxiv.

(٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٧) پاش مردنی هیگڵ، جارێکی تر، شیلنگ لە ساڵی ١٨٣٤دا بووەوە بە مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی بەرلین. ئەنگلس و کیرکیگارد ئامادەی لێکچەرەکانی دەبوون.

(٨) Hume, David. *A Treatise of Human Nature*. London: The Clarenden Press. 1978. p.3.

(٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(١٠) هەمان سەرچاوە.

(١١) با ئەوە فەرامۆش نەکەین، زانایانی فێرگەی هۆشەکی، وەکوو ئەفلاتون، دێکارت، لایبنیز و سپێنۆزا، پێش ئەلبێرت ئاینشتاین ژیاون. ئاگایان لە فیزیکی نوێ و ماتماتیکی نوێ نەبووە کە بەگوێرەی ئەم دوو زانستەی ئەمڕۆ هیچ شتێک نەگۆڕ و ڕەها نییە.

(١٢) Descartes, Rene. *Meditations*. trs. Elizabeth Anscombe & Peter Thomas Geach. The Open University Press. 1971. p67.

(١٣) Kant, Immanuel. *Critique of Pure Reason*. trs. Max Müller. New York: Anchor Books. 1966. A:150-B:74.

(١٤) Aristotle. *Metaphysics*. trs. W. D. Ross. Second Edition. The Clarendon Press. 1928. p.123.

(١٥) Kant, op. cit. A:59-52, B:620-623.

(١٦) Hamlyn, D. W. *Schopenhauer*. London: Routledge & Kegan Paul. 1980. p.6.

(١٧) فریدریک ئێرنست شلایەماخەر، زانایەکی ڕۆمانتیکی ئەڵمانییە و وەکوو یاکۆبی فەلسەفەکەی لەسەر زەمینەی شعور دامەزراندووە.

(١٨) Solomon, Robert. po. cit., p.98.

(١٩) Lukacs, George. *The Young Hegel*. Trs. Rodney Livingstone. London: Merling Press. 1975. p.243.

(٢٠) Hegel. *The Phenomenology of Mind*. Trs. J. B. Baillie. New York: Harper Colophon Book. 1967. p.79.

(٢١) Popper, Karl. *The Open Society and its Enemies*. Vol. II. London: Routledege & Kegan Paul. 1966. p.32.

(٢٢) Solomon. R. Op.cit., p.37.

(٢٣) ibid., p.18.

(٢٤) Kojéve. Alexander. *Introduction to the Reading of Hegel*. trs. Jannes H. Nicholas. London: Cornell University Press. 1969. p.179.

(٢٥) هەمان سەرچاوە.

(٢٦) Burnet, John. *Greek Philosophy; Thales to Plato*. London: Macmilan Co., 1969. p.134.

(٢٧) Plato. *Phaedrus*. 265D, The Dialogues of Plato. Trs. B. Towett. Vol. III. London: Oxford University Press. 1953.

(٢٨) Kant. Op.cit., A:466-B:494.

(٢٩) دەشێت لێرەدا زەحمەت بێت زاراوەی (ماتەریاڵ) بەکار بهێنین، چونکە هیگڵ وەکوو فیختە و بارکلی ماتەر دەگەڕێنێتەوە بۆ بیرەکان. هۆش و بابەتی هۆش تەنیا لۆجیکانە دژوارن.

(٣٠) تیۆدۆر ڤیزنگروند ئەدۆرنۆ (Theodor Wiesengrand Adorno) (١٩٠٣–١٩٦٩) فەیلەسووفێکی ئەڵمان و یەکێکە لە زانایانی فێرگەی فرانکفۆرت. ڕۆڵێکی مەزنی لە شۆڕشی خوێندکارانی ئەڵمانیادا بینی، تەنانەت بە پێغەمبەری شۆڕش ناسرابوو. وەکوو زۆربەی زانا چەپڕەوەکان لەگەڵ سەرهەڵدانی نازیزمدا ڕووی کردە هەندەران و ماوەیەک لە ئەمریکا ژیا. دوای ڕووخانی ئەو ڕژێمە، بە پێچەوانەی مارکۆزەوە، گەڕایەوە بۆ ئەڵمانیا.

(٣١) Hegel. *Science of Logic*. Trs. A. V. Miller. New York: Humanities Press. 1976. p.536.

(٣٢) Hegel. *Lectures on the Philosophy of History*. Trs. J. Sibree. New York: Dover Publications. 1956. Section II. p. 173.

(٣٣) Hegel. Op. cit., p.7.

(٣٤) هەمان سەرچاوە. لاپەڕە ١٥٠

(٣٥) هەمان سەرچاوە.

(٣٦) Russell, Bertrand. *The Problems of Philosophy*. Oxford University





Press. 1967. p.25.

(٣٧) Hegel. Op. cit., p.160.

(٣٨) Aristotle. Op. cit., Book Z-10, 35b-36a.

(٣٩) Hegel. Op. cit., p.170.

(٤٠) Hegel. *Science of Logic*. Trs. A. V. Miller. New York: Humanities Press. 1976. p. 196.

(٤١) Hegel. *The Phenomenology of Mind*. P.212.

(٤٢) Solomon, Robert. Op. cit., p.425.

(٤٣) Hegel. *The Philosophy of History*. p.116.

(٤٤) مەبەستی هیگڵ لە مێژووی جیهان ئەو مێژووەیە کە گۆڕانکارییەکانی پێڕەوی یاساکانی لۆجیکی دیالێکتیک دەکەن.

(٤٥) شودراس، نزمترین کۆمەڵی ناو کۆمەڵگای هیندیە و ئەندامانی ئەم کۆمەڵە بە پیس و گڵاو دادەنرێن.

(٤٦) Hegel. Op. cit., p. 189.

(٤٧) ibid., p. 190.

(٤٨) بڕوانە: Aristotle. *Nichomachean Ethics*. Trs. Thomson. New York: Penguin Books. 1976. 1161a32-b6. p. 278.

(٤٩) Hegel. op. cit., p. 341.

(٥٠) Hegel. *The Phenomenology of Mind*. P.231.

(٥١) هەمان سەرچاوە.

(٥٢) Aristotle. *Nichomachean Ethics*.

(٥٣) Hegel. Op. cit., p. 231.

(٥٤) هەمان سەرچاوە.

(٥٥) Perelman. C. H. *An Historical Introduction to Philosophical Thinking*. trs. Kenneth A. Brown. University of Brussels. 1965. p.71.

(٥٦) Hegel. Op. cit., p. 232.

(٥٧) هەمان سەرچاوە.

(٥٨) ڕاڕەوی گومانکاری، لێرەدا، کە هیگڵ باسی کردووە، بۆچوونەکانی دێکارت و دایڤد هیوّم و ئیمانوئێل کانت ناگرێتەوە. مەبەستی ئەم ئەو ڕاڕەوە گومانکارییەیە کە لە یۆناندا لەگەڵ هەندێک شاگردی فەلسەفەدا وەکوو ئەرکیسلوس (٣١٥-٢٤٠ پێش زاین) و کارنیاویش (٢١٣-١٢٩ پێش زاین) و فیرۆ (٣٦٥-٢٧٥ پێش زاین) سەری هەڵدا. ئەم ڕاڕەوە گومانکارییە، گومانێکی ڕەهایان لە ئاستی بوونی جیهانی دەرەکیدا هەبوو.

(٥٩) بڕوانە پەرتووکەکەی دیڤد مەکلیلان: McLellan, David. *The Young Hegelians and Karl Marx*. Macmillan. 1070. p.18.





(٦٠) Marx, Karl. *Capital*. Vol. 1, Afterward to the second German Edition 1873. Moscow: Progress Publishers. 1974.

(٦١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٧٤

(٦٢) جۆرج لۆکاش (١٨٨٥–١٩٧١) زانایەکی مارکسیستی هەنگارییە. لە ساڵی ١٩١٨دا بوو بە ئەندامی پارتیی کۆمۆنیستی هەنگاریا و ماوەیەکیش لە زانکۆی بۆداپست مامۆستا بوو. لە ساڵی ١٩٥٦دا لە حکومەتی (ناگی)دا، کە تەمەنکورت بوو، وەزیری کولتوور و ڕۆشنبیری بوو. لە دواساڵەکانی تەمەنیدا گەڕایەوە سەر کاری مامۆستایەتی.

(٦٣) ئادەم شاف، لە ساڵی ١٩٥٩ تا ساڵی ١٩٦٨ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتیی کۆمۆنیستی پۆڵۆنیا بوو. لەسەر ئەو ڕایەی لەسەر نامۆیی باسمان کرد (ڕەخنە لەسەر چارەسەرکردنی نامۆیی لە کۆمەڵگای سۆشیالیستیدا) لە ساڵی ١٩٦٨ لە پارتەکەی دەرکرا و مافی ئەندامێتی لێ سەندرایەوە.

(٦٤) ڕۆجیە گاروودی، تاکو سڵای ١٩٧١ ئەندامی پارتیی کۆمۆنیستی فەرەنسا بوو، ماوەیەکیش ئەندامی مەکتەبی سیاسیی ئەم پارتییە بوو. یەکێکە لەو مارکسیستانەی جەنگێکی زۆری دژی سارتەر و بوونخوازی بەرپا کرد. لە ساڵی ١٩٦٣دا لە کۆنگرەیەکدا کە لەسەر ئەدەبی کافکا لە چیکۆسلۆڤاکیا بەسترا وتی: "وەکوو مارکسیستێک دەڵێم پێویستە لە کافکاوە فێر بین چۆن لەگەڵ نامۆییدا زۆرانبازی بکەین." ئێستا ڕۆجیە گاروودی وازی لە مارکسیەت و خەباتی چینایەتی هێناوە و بووە بە موسوڵمان و بەرگی لە ئایینی ئیسلام دەکات.

(٦٥) Mandel. Ernest and Novach George. *The Maxist Theory of Alienation*. New York: Pathfinder Press. 1076. p.10.

(٦٦) *Concise Routledge Encyclopedia of Philosophy*. London: 2000. p. 169.

(٦٧) Hegel. The phenomenology of Mind. p. 467.

(٦٨) سۆفۆکلس (٤٦٩–٤٠٦ پێش زایین) نووسەری یۆنانی لە شاری کۆلۆنوس چاوی بە دنیا هەڵناوە. نزیکەی سەد شانۆگەری نووسیوە و ئەمڕۆ تەنیا حەوتیان گەیشتوونەتە دەستی ئێمە و نەفەوتاون. ئەم نووسەرە لە ساڵی ٤٦٨ی پێش زایین خەڵاتی باشترین نووسەری پێ دراوە.

(٦٩) Sophocles, *Antigone*. The Theban plays. trs. E. F. Walting. New York: Penguin Books. 1984. p. 139.

(٧٠) Hegel. Op. cit., p. 479.

(٧١) ibid., p. 475.

(٧٢) ibid., p. 605.

(٧٣) Hegel. *Philosophy of Right.* Sections 272-275, pp. 174-179.

(٧٤) Hall. Ronald. *The Encyclopedia of Philosophy.* vol. II, Pal Edwards. The Macmillion Company and the Free Press. New York: 1967. p. 385.

هەروەها بڕوانە پەرتووکی: Kamal, Muhammad. *Hegel's Metologic.* Royal





Books Campany. 1989. p.1.

(٧٥) Plato, *The Republic.* trs. Desmond Lee. Penguin Books. 1974. Chap. VII, 534E.

(٧٦) Kamal, Muhammad. Op. cit., p. 3.

هەروەها بڕوانە: الشهرستانی، الملل والنحل، الجزء الاول، دار المعارف، بیروت، ١٩٧٥، ص٦٧

(٧٧) Kant. *Critique of Pure Reason*. A: 61, B: 85.

(٧٨) Hegel. *Encyclopedia*. Section 96.

(٧٩) ناتوانین بڵێین کە هیگڵ خاوەنی ئەم بیروباوەڕەیە، چونکە سپینۆزا لە پێش ئەمدا باسی ئەم مەسەلەیەی کردووە و لەو باوەڕەدا بووە، کە هەموو کێشەیەکی پۆزەتیڤی نێگەتیڤیشە. بڕوانە: Spinoza. *Ethics*. Introduction by T. S. Goegory. Book I. London: Dent & sons Ltd. 1936. part 1, Definition VII.

(٨٠) Hegel. Op. cit., Section 85.





# ئیندێکس







**ز**



**س**



**ش**



**ف**







## سەرچاوەکان


1. Aritstotle. *Metaphysics*. Trs. W. D. Ross. London: The Clarenden Press. 1928.
2. ______. *Nichomachean Ethics*. Trs. Thomson. New York: Penguin Books. 1976.
3. Audi, Robert. *The Cambridge Dicionary of Philosophy*. Cambridge University Press. 1995.
4. Burnet, John. *Greek Philosophy*: Thales to Plato. London: Macmillan Co. 1969.
5. Descartes, Rene. *Meditations*. Trs. Elizabeth Anscombe & Peter Thomas Geach. The Open University Press. 1971.
6. Hall, Ronald. *The Encyclopedia of Philosophy*. Vol. II. Macmillan Co. 1967.
7. Hamlyn, D. W. *Schopenhaure*. London: Routledge & Kegan Paul. 1980.
8. Harris, H. S. *Hegel's Development, Night Thoughts*. (Jena 1801-1806). London: Oxford University Press. 1983.
9. Hegel, G. W. *Encyclopedia of the Philosophical Sciences*. Foreword by J. N. Findlay. Oxford University Press. 1985.
10. ______. *Lectures on the Philosophy of History*. Trs. J. Sibree. New York: Dover Publications. 1956.
11. ______. *Philosophy of Right*. Trs. T. M. Knox. Oxford University Press. 1971.
12. ______. *Science of Logic*. Trs. A. V. Miller. New York: Humanities Press. 1976.
13. ______. *The Phenomenology of Mind*. Trs. J. B. Baillie. New York: Harper Colophon Book. 1967.
14. Hume, David. *A Treatise of Human Understanding*. London: The Clarenden Press. 1978.
15. Kamal, Muhammad. *Hegel's Metalogic*. Royal Book Co., 1989.
16. ______. *Toward Hegel's Anthropology*. Karachi University Press. 1992.
17. Kant, Immanuel. *Critique of Pure Reason*. Trs. Max Muller. New York: Anchor Books. 1966.
18. Kaufmann, Walter. *Hegel: Re-interpretation*. New York: garden City. 1965.






19. Kojeve, Alexander. *Introduction to the Reading of Hegel*. Trs. Jannes H. Nicholas. London: Cornell University Press. 1969.
20. Lukas, George. *The Young Hegel.* Trs. Rodney Livingstone. London: Merling Press. 1975.
21. Mandel, Ernist and Novach, George. *The Marxist Theory of Alienation*. New York: Pathfinder Press. 1970.
22. Marcuse, Herbert. *Reason and Revolution*. New York: Hummanities Press. 1954.
23. Marx, Karl. *Capital*. Vol. I. Moscow: Progressive Publishers. 1974.
24. ______. *Economic and Philosophical Manuscripts 1844*. Penguin Books. 1974.
25. McLellan, David. *The Young Hegelians and Karl Marx*. Macmillan Co. 1070.
26. Perelman, C. H. *An Introduction to Philosophical Thinking*. Trs. Kenneth A. Brown. Unversity of Brussels. 1965.
27. Plato. *Phaedrus*. Trs. B. Towett. London: Oxford University Press. 1953.
28. ______. *The Republic*. Trs. Desmond Lee. Pengiun Books. 1974.
29. Popper, Karl. *The Open Society and its Enemies*. Vol.II. London: Routledge & Kegan Paul. 1966.
30. Russell, Bertrand. *Problems of Philosophy*. Oxford University Press. 1967.
31. Solomon, Robert. *In the Spirit of Hegel: A Study of G. W. Hegel's Phenomenology of Mind*. London: Oxford University Press. 1983.
32. Sophocles. *The Theban Plays*. Trs. E. F. Walting. New York: Pengiun Books. 1984.
33. Spinoza. *Ethics*. Book I. London: Dent & Sons Ltd. 1936.
34. Taylor, Charles. *87*. London: Cambridge University Press. 1978.

سەرچاوە عەرەبییەکان

١- الشهرستانی، الملل والنحل، الجزء الاول، دار المعارف، بيروت، ١٩٧٥
٢- البغدادی، عبدالقادر بن طاهر، الفرق بين الفرق، مطبعه المدنی، القاهره، ١٩٧٩



